# نووری قورئان

« کورتە باسێکە لەبارەی قورئان و نووسینەوەی و
کۆکردنەوەو قورڕاو تەجویدی قورئانەوە »

دادراوی

مەلا عبدالکریمی مدرس

١٤٠٥ ی کۆچی
١٩٨٥ ی زایینی

# بسم الله الرحمن الرحيم

به ناوی بەرزی خالیقی عەللام
کە قورئانی کرد بە یاسای ئیسلام

ناوی پیرۆزی ئەو خوداوەندە
دەرگای گوشادە بۆ تەوبەی بەندە

هەر بووەو ئەبێو نەبوونی نی یە
ذاتی لە بوونی وێنە بەری یە

پاکەو بێنیاز لە سۆی کائینات
بێباکەو تاکە بە ذاتو صیفات

زیندووەو زاناو صاحێب ئیرادە
تەوانا لە سەر هەرچی مورادە

ئەبینێو ئەبیێ زەرەو خشەی پێ
پێی مێروولەی ورد لە هەر شوێنێ بێ

خاوەن وتارە لە گەڵ رەهبەران
هەم فەرماندارە لەسەر سەرووەران

پەروەردگارەو (واجب الوجود)
هەر ئەو مەعبوودەو ئەشێ بۆ سجوود

بوون هەر بۆ ئەوە بەمەعنای لایق
بە مەیلی ئەوە بوونی حەقایق

لەسەر خواستی خۆی خالیقی زانا
لە نەبوونەوە جیهانی دانا

رازاندیەوە جیهان بە پرتەو
بە ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەی بە دەو

مەوسیمی ساڵی کرد بە خزمەتکار
عەرزی ڕەنگین کرد بە گوڵ‌و گوڵزار

لە مشتێ خاکی پاکی سەر زەمین
(ئادەم) ی هێناو کردی بە ئەمین

(حەوا) یشی بۆ کرد بە یارو هاوسەر
بوون بە سەردەفتەر بۆ هەموو بەشەر

پاش بوون لە بەهەشت هێنایە سەر عەرز
بۆ عیلم‌و زانست بۆ ڕەوشتی بەرز

وەچەو نەتەوەی لە سەر بساتا
بڵاو بوونەوە بە ڕووی وڵاتا

کردی بە ڕەهبەر لە ڕووی جیهانا
دەستووری ژین و دینی بۆ دانا

جا بۆ تەعلیمی ڕێی بەختیاری
لێی هەڵبژاردن پیاوی دیاری

لە هەر چەرخێکا ئەم سەر تا ئەو سەر
ڕابەرانی نارد بۆ تەمێی بەشەر

بە جوبرەئیلا فریشتەی ئەمین
یاسای ڕاستی نارد لە بۆ سەرزەمین

دە بۆ سەر (ئادەم) پەنجا لە بۆ (شیث)
سی صەحیفە هات بۆ دینی (ئیدریس)

دە بۆ ئیبراهیم (خلیل الرحمن)
بابەی ڕەهبەران تا ئاخر زەمان

گشت بە صەحیفە ناویان براوە
صەحیفە ماددەی لێ نووسراوە

ماددەکەی چەرمە یا بەردە یا دار
وەزعی نووسینی بە پێی ڕۆژگار

حەواڵەی علیمی زاتی خودایە
عەقل ڕێنومای دڵی ئاگایە

تەورات بۆ (مووسا) ڕەهبەری جەلیل
بۆ ئەو فیرعەونی خستە ئاوی نیل

زەبوور بۆ (داوود) مەردی پاڵەوان
بە بەردەقانی (جالووت) ی فەوتان

کە ئەیخوێندەوە ئایاتی زەبوور
دەوروبەری خۆی پڕ ئەکرد لە نوور

کێوو پەلەوەر بە نەغمەی (داوود)
تەسبیحیان ئەکرد بۆ خودای مەعبوود

ئینجیل کتێبی (عیسا) ی بن (مەریەم)
بەندەی خالیصی خالیقی ئەکرەم

یەهوود بە جەفا کەوتنە سەودا
بیکوژن بەڵام ڕەحمەتی خودا

بەرزی کردەوە بۆ قەڵای ئەمان
هەڵی گرت لە عەرز هەتا ئاسمان

داینا بە وێنەی فریشتەی قودسی
لە ماوای حورمەت باشتر لە کورسی

(عیسا) بە بێ باب بێتە ڕووی جیهان
بێتە سەر بەیان بۆ ڕازی پەنهان

هەر بە منداڵی بە بێ مەلالەت
بڵێ ڕەسووڵم خاوەن ڕیسالەت

بە ئەمری خودا گڵ بکا بە تەیر
کوێری مادەرزاد بینا کا بۆ سەیر

بە ئیزنی خودای (أعراض) و (أعیان)
زیندووکاتەوە مردووی بێگیان

سفرە ڕاکێشێ لە ڕووی ئاسمان
بۆ ئیطمێئنانی حەواری‌یەکان

چۆن دائەمێنێ بۆ ڕێگەو بۆ جێ
لەباتیی زەوی با عاسمان بێ

پاش ڕەفعی عیسا سەرزەوی یەکسەر
پڕ بوو لە ئاشووب بە کردەوەی شەڕ

ژینی ئادەمی بوو بە ژاری مار
مردن چاتر بوو لە ژین و ژیوار

تا خودای جیهان بە میهرەبانی
(موحەممەد) ی نارد بۆ نیگابانی

بۆ ئاوەدانیی ڕووی جیهان بە ژین
بە یاسای ڕەحمەت بۆ ژین و بۆ دین

له قه‌ومی قوره‌یش نه‌ته‌وه‌ی قه‌یدار
کوڕي (ئیسماعیل) ڕه‌هبه‌ری نازدار

کوڕی (ئیبراهیم) دۆستی خوداوه‌ند
دژمنی (نه‌مروود) خاوه‌ن دارو به‌ند

له پاش ڕزگاری له ئاگری سوور
ده‌رچوو له عێراق بۆ وڵاتی دوور

له گه‌ڵ کۆمه‌ڵێ له دۆست و خزمان
هیجره‌تی فه‌رموو بۆ خاکی که‌نعان

له پاش ماوه‌یێ به ئه‌مری جه‌لیل
چوو بۆ خاکی میصر خاوه‌ن ئاوی نیل

له‌وێ پادشا له عه‌ینی جێدا
(هاجه‌ره) ناوێ جاریه‌ی پێ دا

کاتێ هاته‌وه له‌و (هاجه‌ر) ناوه
خوا (ئیسماعیل) ی به‌رزی پێ داوه

له پاش ماوه‌یێ (ئیسحاق) په‌یدا بوو
له (سارا) خاتوون که ئامۆزای بوو

جا به فه‌رمانی خودای سه‌به‌ب ساز
(هاجه‌ره) و ڕۆڵه‌ی بردن بۆ حیجاز

(ئیسماعیل) لە گەڵ دایەی بێ لەککە
داینان لەو شوێنا کە بووە مەککە

لە کاتی ویداع (هاجەر) ی غەمبار
لە گەڵ (خەلیل) دا هاتە سەر وتار :

لەم شوێنە چۆڵە بێدەست و بێکەس
چۆن دەوام ئەکەین بە بێ فەریادرەس

وەڵامی داوە حەزرەتی (خەلیل) :
مەئمووری ئەمرم بۆ خودای جەلیل

(هاجەر) بەم واتە دڵی ئارام بوو
چاوەڕێی لوطفی خودای عەللام بوو

کە بە جێی هێشتن لە بەر بێ ئاوی
(ئیسماعیل) ئەسرین ئەهات لە چاوی

لەو کاتا تەیرێ داهات لە بەرزا
چەن جار دەنووکی دا بە سەر عەرزا

ئاو دەرچوو لەویا بە زۆری نەك کەم
بو بە سەرچاوەی مەشهوور بە زەمزەم

ئەونەی پێ نەچوو قەبیلەی جورهوم
قەحطانی نەسەب هاتنە سەر زەمزەم

لە سەر ریعایەی حوقووقی بەشەر
ئیجازەیان خواست لە دایە (هاجەر)

ئەویش بە عەهدی وەفا بە ئەدەب
ئیجازەی فەرموو بە (شیخ العرب)

لەویا مانەوە بە شەرم و حەیا
وەکو خزمەتکار لە دەشت و چیا

(ئیسماعیل) لەوان ژنێکی هێنا
ئەمجا (ئیبراهیم) هات لە بۆ بینا

لە گەڵ (ئیسماعیل) کەعبەی کردەوە
بە ناوی خودای تەنیای فەردەوە

تا لە نەتەوەی پاکی (ئیسماعیل)
پەیدا بوو حەزرەت ڕەهبەری جەلیل

کاتێ پەیدا بوو هەتاوی ڕووی ئەو
جیهان ڕووناك بوو بە نوورێکی نەو

لە چل ساڵیدا ڕەهبەری نازدار
بوو بە چلچرای چەرخی ڕۆزگار

بە سروشتی پاك بە خوڵکی شیرین
ناردی بە ڕەحمەت لە بۆ عالەمین

بوو بە ڕەهنومای گەلی بەهەشتی
بوو بە پێشەوای زانستی گشتی

خوا بۆی نارد قورئان بۆ بەختیاری
بۆ ڕێی پیرۆزی و سەعادەتکاری

جیهان ڕازاوە بە پیرۆزی ئەو
بە یاسای ڕەساو بە دڵسۆزی ئەو

* * * *

پەروەردگارا تۆ بە حەق خودای
شایانی حەمدو سوپاس و ئەنای

ئەنای پڕ صەفا هەر لە بۆ تۆیە
سوپاس بۆ عەطای بارەگای تۆیە

لە سەر ئەو نوورە ناردت بە کەرەم
بە فەیضی ڕەحمەت بۆ هەموو ئومەم

ئەونە کافی بێ بۆ بارەی ذاتت
لە بۆ بارەگای پڕ کەراماتت

* * *

دروودی بێ حەد نەك لە من لە تۆ
بۆ ئەو ڕەهبەرە کە ناردت لە نۆ

یانی (موحەممەد) خۆشەویستی تۆ
بەندەی موخلیصی حەقپەرستی تۆ

بوو بە ئاوێنە بۆ تەجەللای تۆ
بوو بە نوێنەر بۆ تەوەللای تۆ

کە بوو بە مەنبەع بۆ ئیحسانی تۆ
کە بوو بە مەطلەع بۆ قورئانی تۆ

هەم لە سەر ئالی خانەدانی تۆ
لە سەر یارانی یاوەرانی تۆ

لە سەر پەیرەوان لە بۆ دینی تۆ
کە بوون بە بلوور بۆ ئایینی تۆ

لە سەر قاریئان بۆ قورئانی تۆ
کە بەڕاستی بوون بە قوربانی تۆ

هەم موحەددیثان بۆ حەدیثی تۆ
بۆ ڕەسم و ڕێگەی زۆر نەفیسی تۆ

بۆ موجتەهیدان لە بەر دینی تۆ
ئارەزوومەندان بۆ تەمکینی تۆ

له بۆ ئه‌ولیای خاوه‌ن وه‌فای تۆ
له سه‌ر ئه‌صفیای خاوه‌ن صه‌فای تۆ

یانی : مه‌ردانی دڵ پڕ له ئه‌نوار
که بوون به شیفای جه‌فای ده‌رده‌دار

بۆ ئیمه‌یش به‌ڵکو به‌رقێ بێ له نوور
ڕێی پێ ده‌ربکه‌ین بۆ لیقای حضوور

ئه‌وه‌ڵ تا ئاخر بۆ نزیك و دوور
حوضووری تۆیه مه‌قصوود له حضوور

* * *

(وبعد) له‌به‌ر ناره‌سایی دڵ
به وه‌فای ئه‌ده‌ب به یاسای کامڵ

دڵ دوور که‌وته‌وه له نوورو پرته‌و
ڕۆژی ڕووناکی له‌لا بوو به شه‌و

له‌به‌ر تاریکی دڵی داماوم
به عه‌لاوه‌ی دڵ ڕه‌ش بوو به‌رچاوم

به‌م وه‌زعه تاڵه زۆر ترسام له خۆم
چاری خۆم نه‌که‌م به جارێ ئه‌ڕۆم

جا دڵ بە هیوای وەسیلە سازی
کەوتە هاتوچۆ بۆ دڵنەوازی

زۆر پارامەوە لە خوای میهرەبان
نووری بنێری بۆ صەفای دڵان

بە ئیخلاصی دڵ زۆر پارامەوە
لە دوعاکردن نەگەڕامەوە

بە هیوای نووری بینێری بۆ دڵ
تا ڕێگە دەرکاو بگاتە مەنزڵ

ڕۆحی ڕەهبەرم کرد بە وەسیلە
بۆ نەیلی نوورو فەوزی فەضیلە

(الحمد لله) بە فەیضی ڕەهبەر
موژدەی قوبووڵم لەبۆ کەوتەدەر

وەها حاڵی بووم کە نووری دڵان
وا لە خزمەتی ئایاتی قورئان

تاوی پرتەوێ لە نووری قورئان
ئەبێ بە چرای کارەبای دڵان

هەتا هەتایە ناکوژێتەوە
لە بەهەشتیشا ئەدرەوشێتەوە

شەونمی فەیضی دەریای هیممەتە
ئاوی حەیاتی بەقای ئوممەتە

ئەبێ بە زەیتی دەروونی ئینسان
شەوق ئەداتەوە ئەنواری ئیحسان

نورُهم يَسعىٰ بَينَ أيديهِمْ
لِهُداتِهِمْ ومهتديهم

* * *

ئەنواری قورئان بە فەیضی سەرمەد
سەری وا لەناو سینەی (موحەممەد)

واتە ئەو جیلوە کاتێ نازڵ بوو
واریدی سینەی مەولای کامڵ بوو

لە سینەی ئەوۆ وەکو کارەبا
بە سینەی صافی موسوڵمانێ ئەگا

وایەر پەیوەندە بە مەعنا ئیمان
بەو نەهجە ئەنوار دێ بۆ موسوڵمان

بەم موژدە دڵم بوو بە پەرەی گوڵ
ڕووم کردە قورئان بە ئیخلاصی دڵ

چەن دەرزم نووسی بۆ موسوڵمانان
عینوانم دانا بە (نووری قورئان)

لە دەرزی مێژووی قورئانی ئەنوەر
چلۆن هاتە خوار بۆ لای پێغەمبەر ؟

چۆن نووسرایەوە کێ بوو نووسەری
لە گەلی یاران کێ کردیە بەری ؟

تەعریفی چی یەو ئەحواڵی چەندە ؟
کە هۆی پیرۆزین بۆ دڵی بەندە

مەککی و مەدەنی و حەضەری و سەفەر
لەیلی و نەهاری و فیراشی ئەنوەر

صەیفی و شیتائی بە شێوەی ئەکمەل
(أوَّلُ مانَزَل آخرُ مانَزَل)

چەن ئەحواڵی تر پێویستن بۆمان
زانینیان خێرە بۆ حاڵی خۆمان

پاش فەوتی ڕەهبەر چۆن بوو تەرتیبی
جەمعی دووجارەو خەطو تەهذیبی

چۆنیان خوێندەوە قاریئانی پاك
قیرائەی سەبعە بەشێوەي ڕووناك

حوکمی چلۆنە تەجویدی قورئان
چۆن بوو ئادابی گەلی قاریئان

(الحمد للّه) بە فەیضی ڕەسوول
خامە هاتە سەر نووسینی مەئموول

ئەمەیە غایەی بە مایەی (نامی)
بە نووری قورئان باش بێ ئەنجامی

ئێوەیش بە دوعای دەوامی تەوفیق
لەم تێکۆشانا ببن بە ڕەفیق

هیوام وەهایە لە هەردوو جیهان
بگەین بە بەهرە بە نووری قورئان

نووری وەربگرین بۆ ڕووناکی دڵ
هەر بەو نوورەوە بگەین بە مەنزڵ



# دەرزی یەکەم

دەرزی یەکەمین دەرزی طلووعە
طلووعی ڕۆژی تکا مەسمووعە

دەرزی تیژگی نووری بەمایە
نووری هەتاوی هەتا هەتایە

بەرەبەیانی هاتنی ڕەهبەر
ڕەهبەری ڕێگای پیرۆزی بەشەر

وتمان پاش (عیسا) تاریك بوو جیهان
تاریك بوو صەفحەی ئەرزو ئاسمان

چەرخێ بوو نەبوو وەحیی ئاسمان
دەورێ بوو نەما ئیمان و پەیمان

کە ئیمان نەما پەیمان نامێنێ
نەمانی پەیمان ستەم ئەڕوێنێ

جا ذاتی باری بە میهرەبانی
جیلوەی خستە سەر نەوعی ئینسانی

ساڵی پینج صەدو حەفتاویەك نەچوو
تەجەللای ئەنوار کەوتە هاتوچوو

بەرەبەیانی دووشەممەی پیرۆز
هاتە دونیاوە ڕەهبەری دڵسۆز

لە شەوی دوازدەی ڕەبیعی یەکەم
بیستی نیسانی ڕۆمی موقەددەم

بە وێنەی گوڵی گوڵباغی بەهەشت
جیهان بێنْ خۆش بوو هەردەو کێوو دەشت

دونیا ڕازاوە زیاتر لە عادەت
بوو بە سەمەری صوبحی سەعادەت

ئەم ذاتە بەرزە کاتێ پەیدابوو
چەن مانگێ پێشتر باوکی فەوتابوو

بۆیە باپیرەی بەشان و عەرزی
بوو بە مورەببی ڕۆڵەی سەربەرزی

بە هیوای ثەنای سیمای تا ئەبەد
ناوی خۆشناوی کرد بە (موحەممەد)

واقیعەن وابوو چەن ثەنای بۆ هات
لە لای خوداوە بە گەلێ ئایات

ئیستەیش بە دەوام هەر ثەنای بۆ دێ
هەتا هەتایە ئاخری نایێ

پاش چەندێ ڕابورد لە ویلادەتی
لە نەشئونومای پڕ سەعادەتی

دایە (حەلیمە) ی سەعدییە نەسەب
هات بردی لەبۆ بادییەی عەرەب

تا بە هەوای پاك لەگەڵ صەفای دڵ
پێ بگا بێغەش وێنەی پەڕەی گوڵ

لە پاش ماوەی شیر هێنایەوە شار
بەڵام بردیەوە بۆ خۆشی ژیوار

لە چوار ساڵیدا جبریلی ئەمین
(شقّ الصدر) ی کرد بۆ نووری یەقین

جا هێنایەوە دایەی بێلەککە
بۆ ماڵی باپیر لە شاری مەککە

ئەمجارە دایکی ئەو نەورەسیدە
بەخێوی ئەکرد وەك نووری دیدە

لە ساڵی شەشدا ئەو پڕتەمکینە
لەگەڵ دایکیا چوو بۆ مەدینە

کە گەڕانەوە بۆ مەککەی ئاوا
دایکی نەخۆش کەوت لە خاکی (ئەبوا)

هەر لە ئەبوادا موتەوەففا بوو
حەزرەت بەو مەرگە دڵ پڕجەفا بوو

جا (أمّ أيمن) خادیمەی ژیری
زوو هێنایەوە بۆ لای باپیری

باپیری بەرزی بە صیدق و صەفا
خزمەتی ئەکرد بێ جەورو جەفا

هەشتەمین ساڵی شای شیرین لیقا
باپیری ڕۆیی بۆ (دار البقا)

لە نەخۆشیدا (عبدالمطلب)
وەصییەتی کرد بۆ (أبو طالب)

خزمەتی بکا بە یاسای ڕەحمەت
ئەویش وەفای کرد بەحەققی خزمەت

لەپێش بلووغا سەییدی ئەنام
لەگەڵ ئەم ذاتا ڕۆیی لەبۆ شام

کە چوونە (بوصرا) بە ئەمری ڕاهیب
مەنعی سەفەر بوو لە (أبوطالبْ)

زوو گەڕانەوە بۆ شاری مەککە
لە ترسی یەهود دڵ پڕ لە لەککە

له بیست و پێنجا زۆر بەدەستوبرد
عەقدی نیکاحی (خەدیجە) ی بۆ کرد

لە سی و پێنجا بوو کە قورەیش بە جەم
چوون بۆ تەعمیری کەعبەی معظمً

لە سەر دانانی حەجەرولئەسوەد
ئیختیلافیان کرد بێ سامان و حەد

هەموو جەزرەتیان دانا بە حەکەم
ئەویش ئەمری کرد بۆ دەفعی ئەلەم

حەجەریان هێنا بە قەدرو کەماڵ
دایاننا لەناو جلێ وەك بەرماڵ

قەومەکان هاتن هەموو بە یەکجار
بەرزیان کردەوە ئەو نایە دیوار

خیلاف لەبەینی ئەوان زائیل بوو
خۆیشی بە فەیضی نەصبی نائیل بوو

لەو تەئریخەوە بەدڵ ئەو ذاتە
کەوتە تەفەککور لەم کائیناتە

چۆن ئەبێ عالەم بێ سەرو سامان
بێ پەروەردگار بێ دین و ئیمان

چۆن ئەبێ ئینسان لەبۆ بەردو دار
ببێ بە بەندەی عیبادەت گوزار

وا ئەم فیکرەیە شعووری داگرت
لە هەموو بەشەر بە دڵ دووری کرد

هەر ساڵێ مانگێ ئەڕۆیشتە غار
ناو غاری حیرا لە صەفحەی کۆسار

بە فکری عالی نوورانی ئەبوو
ڕۆژ بەڕۆژ نەفسی ڕۆحانی ئەبوو

هەتا تەمەنی گەیشتە چل ساڵ
عەقڵی گەیشتە مەرتەبەی کەماڵ





# دەرزی یەکەم بە پەخشان

زانـاکانی سیـرەتی حەزرەتی پێغـەمبەر (ﷺ) نـووسیویـانە کـە : حەزرەتی موحەممەدی عـەرەبی (د . خ) کوڕی (عـەبدوڵـڵا) ی کوڕی (عەبدولموططەلیب) ی کـوڕی (هاشم) ی کـوڕی (عەبـدولمەنـاف) ی کوڕی (قوصـەی) ی کوڕی (کیـلاب) ە . دایکیشی ناوی (ئـامینە) ی کچی (وەهەب) ی کوڕی (عەبدولمەناف) ی کوری (زەهرە) ی کوڕی (کیلاب) ە . لەم ذاتەدا ڕشتەی نـەسەبی بـاوك و دایکی ئەگـەنەوە بـە یەك .

ئەمانە لە هۆزی (قورەیش) وە لە ئەولادی (عەدنان) و لە نەتەوەی (قەیدار) ی کوڕی (ئیسماعیل) ی کوڕی (ئیبراهیم) ی خەلیلن دروودی خودایان لەسەر بێ .

باسی ئیبراهیم لە مێژووی دینا دیارە . کـورتە کـەی ئەمـەیە : ئیبراهیم کوری (ئازەر) ە و لە عێراقا لە دایك بووە . شوێنی لە دایك بوونی شاری (کوتا) بووە لە وڵاتی (بابل) یا (شەرقات) لە بەینی (تکـریت) و (مـوصڵ)دا ، یـا (شوش) لـە نزیکی شـاری (عەقـرە) دا لە شیمـالی مووصڵەوە .

پاش ئەوە خودا کردی بە پێغەمبەری خۆی و (نەمرود) بە مەنجەنیق فرەیدایە ناو ئاگرەوەو بە سەلامەتی رزگار بوو ، بە زۆری (نەمرود) لـە عێراق کۆچی کرد بۆ وڵاتی (کەنعان) لە فەلەستین و لەوێ دانیشت . جا سەفەری کرد بۆ (میصر) بۆ لای پاشای (میصر) . پاشای (میصر) زۆری حورمەت گرت و جاریەیەکی (هاجەر) ناوی پێ دا . پاشان (ئیبراهیم) گەڕایەوە بۆ کەنعان ؛ پاش ماوەیێ لە (هاجەر) کـوڕێکی بوو نـاوی نا (ئیسمـاعیـل) . لـە (سـارا) ی تـامـوورایشی کـوڕێکی بـوو نـاوی نـا (ئیسحاق) .

جا به فه‌رمانی خودای ته‌عالا (هاجه‌ر) و (ئیسماعیل) ی کوری له که‌نعانه‌وه برد بۆ (مه‌ککه) که له‌و کاته‌دا چۆڵ بوو . به هاجه‌ریشی فه‌رمووو که له‌وێدا بمێنێته‌وه . هاجه‌ر وتی : له‌م شوێنه‌دا بێ‌که‌س چۆن ئه‌ژین ؟ ئیبراهیم فه‌رمووی : خودا فه‌رمانی وایه‌و خودا زایه‌تان ناکا . ئیبراهیم گه‌رایه‌وه . له‌و ساته‌دا (ئیسماعیل) داوای ئاوی کرد ، (هاجه‌ر) نه‌یزانی ئاو له‌ کوێدا هه‌یه . له ناکاو په‌له‌وه‌رێ له حه‌واوه نیشته‌وه ، ده‌ستی کرد به ده‌نووك‌دان به عه‌رزا ، له شوێنی ده‌نووکه‌که‌یدا ئاو ئه‌هاته ده‌ره‌وه . هاجه‌ر رۆیشت ئه‌و شوێنه‌ی هه‌ڵدایه‌وه‌و ئاوی لێ هاته‌ده‌ره‌وه‌و بوو به کانی‌و هه‌میشه ئاوی لێ ده‌رئه‌چوو ، که ئیسته به‌و کانی‌یه ئه‌ڵێن : (زه‌مزه‌م) . له‌م سه‌رده‌مه‌دا خێڵێکی عه‌ره‌بی به قه‌حطانی مه‌شهوور به (جورهوم) له‌و شوێنه‌دا دابه‌زین‌و شێخه‌که‌یان هات ئیزنی خواست له هاجه‌ر له‌و کانی‌و ئاوه ئاو وه‌ربگرن ، ئه‌ویش له سه‌ر عه‌هدو په‌یمانی ئه‌و رۆژه په‌یمانی به‌ست له‌گه‌ڵیاندا که : ئاوه‌که‌ی داگیر نه‌که‌ن‌و موعامه‌له‌یان باش بێت . به‌م قه‌راره ئه‌و هۆزی جورهومه له‌وێدا دامه‌زران‌و خزمه‌تی هاجه‌رو ئیسماعیلیان ئه‌کرد . ئیسماعیل له ناو ئه‌واندا فێری زمانی عه‌ره‌بیی قه‌حطانی بوو ، که زمانی ئیسته‌ی قورئانه .

ئیبراهیم جاربه‌جار ئه‌هات بۆ لایان جا کاتێ که ئیسماعیل گه‌وره بوو ، حه‌زره‌تی ئیبراهیم هاته‌وه له‌گه‌ڵ ئیسماعیلدا خانه‌ی خودا (که‌عبه)ی پیرۆزیان دروست کرد که بوو به عیباده‌تخانه‌ی دینی حه‌زره‌تی ئیبراهیم‌و شوێنی ته‌وحیدو خودای تاق‌و ته‌نیا په‌رستن . دینی ئیبراهیم له‌و وڵاته‌دا بڵاو بووه‌وه . پاش ماوه‌یێ ئیسماعیل له‌و هۆزی جورهومه ژنی هێناو دوازده کوری بوو . گه‌وره‌که‌یان که ناوی قه‌یدار بووه باپیره گه‌وره‌ی عه‌دنانه که باپیره گه‌وره‌ی هۆزی قوره‌یشه‌و حه‌زره‌ت (ﷺ) له نه‌ته‌وه‌ی ئه‌وه .

حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د (ﷺ) کوری عه‌بدوڵلا ، کوری عه‌بدولموطه‌لیب ، کوری هاشیم ، کوری عه‌بدوله‌نافه . دایکیشی

ئـامینەی کچی وەهـەبی کوڕی عـەبدولمـەنافی کـوڕی زەهرەی کـوڕی کیلابە .
لە بەرەبەیانی شـەوی دووشەممـەی دوازدەهەمی رەبیعـولئەووەل رێکەوتی بیستی مانگی نیسانی رۆمی شەرقی لە دایك بووە . لەبەرئەوە کە عـەبدوڵـڵای باوکی بـە چەنـد مانگێ پێش تـەوەللودی حـەزرەت لـە سەفەرێکی تیجارەتا وەفاتی کرد بوو ، عەبدولموطەلیبی باپیرەی خاوەن عائیلەکە بوو ناوی‌نـا (موحـەممەد) درووودی خـوای لێ بێ . بە یـاسای ئەشرافی قورەیش کە منداڵیان لە بادیەی عەرەبدا بەخێو ئەکرا ، دایان بە حەلیمەی سەعدییە بردی بۆ بادیـە شیری پێ‌بـدا . پاش تـەواو بوونی مـاوەی شیرپێـدانی ، حەلیمـە هێنایـەوە بۆ خـزمەتی (عبـدالمـطلب) ی باپیری ، لە شاری مەککە ، بەڵام لەبەر ئەوە کە پیرۆزی خۆیانی لەووە ئەزانی ، بە ڕجا ڕجای لێ‌کرد پێ‌یاندایەوە بردیەوە بۆ بادیەی عەرەب .
لە تەمەنی چوار ساڵیدا ڕۆژێ لەگەڵ برا هاوشیرەکەیـدا بوو لـە دەرەوە ، لەناکاو براکەی چاوی کەوت بە پیاوێکی جل سپی هـات ، موحەممەدی گرت‌و سنگی لەت کردو ئەوەندەی پێ‌نەچوو لە بەرچاوی ون بوو . موحەممەد لە شوێنی خۆیا ڕەنگی گۆڕا ، کاتێ برا هاوشیرەکەی ئەمەی چاوپێکەوت ڕۆیشت بۆ لای حەلیمەی دایکی ، ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕایەوە . حەلیمە کە ئەمەی بیست ڕای کرد موحەممەدی هێنایەوە بۆ ماڵەوەو بە مێردەکەی وت : ترسم هەیە موحەممەد لە لای ئێمە گیرۆدەی نەخۆشی یەك ببێ ، با بیبەینەوە بـۆ لای باپیـری . بردیـانەوە بـۆ لای (عبدالمطلب) و ئـەو وەزعەیـان بۆ گێـڕایەوە . ئـەویش ووتی : یەعنی ترساون لەوە ئەم کوڕە تووشی دەردێکی خراب ببێ ؟ حاشا ئەم کوڕە تووش نابێ‌و پایەیەکی زۆر بەڕزی ئەبێ .
حەزرەت (د . خ) لە ماڵی باپیریا مایەوە تا گەیشتە تەمەنی شەش سـاڵە . لـەو تەمـەنەدا لـە خزمـەتی (ئامینـە) ی دایکی‌و (أمّ أیمن) ی کارەکەریان لە مەککەوە چـوون بۆ مـەدینە بـۆ زیارەتی مـاڵی خزمـان‌و

برایانیان . ماوەیێ لە مەدینە مانەوە ، پاش گەڕانەوە بۆ مەککە کاتێ گەیشتن بە ئەبواء کە شوێنێکە لە بەینی مەککەو مەدینەدا ، دایکی نەخۆش کەوت و وەفاتی کرد جا حەزرەت لەگەڵ (أمّ ایمن) دا هاتەوە بۆ مەککە بۆ ماڵی باپیری لەوێ بە ئاسایش ئەژیا .

لە تەمەنی هەشت ساڵیدا بوو کە باپیری وەفاتی کرد . باپیری وەصییەتی کردبوو بۆ (أبوطالب) ی کوڕی کە خزمەتی موحەممەدی برازای بکا ، ئەویش لەسەر ئەو وەصییەتە خزمەتی ئەکرد .

لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا (أبوظالب) ڕۆیشت بۆ شام و موحەممەدی لەگەڵ خۆی برد . کاتێ گەیشتنە شاری بوصرا لە سنووری شام (بحیرا) ناوی ڕاهیب نەصیحەتی (أبوطالب) ی کرد کە نەیبا بۆ شام نەکا جوولەکە زیانی پێ بگەیەنن . (أبوطالب) هێنایەوە بۆ مەککە .

لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا لەگەڵ (زبیر) ی مامیدا سەفەری یەمەنی کردو بە سەلامەتی گەڕانەوە بۆ مەککە .

لە دەوری عومری بیست و چواردا بوو بە عامیل بۆ (خەدیجە) ی کچی (خویلد) کە ژنێکی دەوڵەمەند بوو ، وە لەگەڵ (میسرە) ناوی غولامی (خەدیجە) دا هاتوچۆیان ئەکرد لەبەر ئەوە کە بە کوڕێکی شەریف و خاوەن قەدر هاتە پێش چاوی خەدیجە ، ویستی شووی پێ بکا . (أبو طالب) کە ئاگادار بوو لە مەوضوعەکە ڕۆیشت خوازبێنی یەکی بەحورمەتی خەدیجەی کردو مارەی کرد لە حەزرەت (د . خ) کە لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا بوو . (خەدیجە) یش چل ساڵان بوو .

پاش ئەمە حەزرەت (ﷺ) لە خانەدانی خۆیدا بە ئاسایش و سەربەرزی و هێمنی و خێرۆمەندی خەریکی تیجارەت بوو هەتا عومری گەیشتە سی و پێنج ساڵ لەو ساڵەدا هۆزی قورەیش تەعمیری ماڵی خودا کەعبەی پیرۆزیان کردەوە ، بەڵام لەسەر دانانی (حجر الأسود) لە شوێنی خۆیدا بشێوە کەوتە ناویان . لە ئەنجامدا حەزرەتیان کرد بە حەکەم بۆ

چاری ئەو بشێوەیە . ئەویش فەرمانی دا بەرماڵێکی پاکیان هێناو بەردەکەیان خستە ناوی . جا فەرمووی : لە هەر طائیفەیەك یەکێکیان بنەوێ لە گۆشەی ئەو بەرماڵەو بەهەموویان هەڵی بگرن . کاتێ بەرزیان کردەوە حەزرەت (د.خ) خۆی بەردەکەی لە بەرماڵەکە هەڵگرت و لە شوێنی خۆیا لە دیواری کەعبەدا داینا . بەوە چاری ئاشووبەکەی کردو خۆیشی شەرەفی دانانی (حجر الأسود) ی وەرگرت .

لەم کاتە بەولاوە حەزرەت (ﷺ) حاڵی گۆرا ، کەوتە بیرکردنەوە لە جیهان بە تایبەتی لە خەرافاتی خەڵکی مەککە ، کە خۆیان بەرد ئەتاشن و ئەیکەن بە مەعبوودو ئەیپەرستن . هەروا بیری ئەکردەوە لە پەروەردگاری جیهان : ئایا ئەم عەرزە جوانەو ئەم ئاسمانەو ئەم ئەستێرانەو مانگ و رۆژ کە لەسەر یاسایەکی رێك هاتوچۆ ئەکەن و شەوو رۆژو مانگ و ساڵ پەیدا ئەبێ چۆن مومکین ئەبێ پەروەردگارێکی زاناو توانای نەبێ و ، بۆچی کەسێ نی یە بیربکاتەوە لە خۆی کە : کێ دروستی کردوەو بۆچی دروست کراوەو ئەنجامی چی یە ؟ خۆ نابێ ئادەمیزاد وەکو گیانلەبەرە بێ عەقڵەکان بژین و بمرن و پرسیارێ نەبێ لە کردەوەیان . لەبەرچی رشتەی خزمایەتی و رەحم و میهرەبانی بچراوە ؟

بۆ ئیختیاری شوێنێکی خاڵی و تەنهایی هەموو ساڵێ ماوەی مانگێ ئەرۆیشتە ئەشکەوتی (حراء) لە کێوێ لە کێوەکانی ئەطرافی مەککەدا رای ئەبوارد . هەروا لەسەر ئەم یاسایە دەوامی کرد هەتا تەمەنی گەیشتە چل ساڵە . لەو ئەشکەوتەدا فریشتەی خودا هاتە سەری و خەڵاتی پێغەمبەرێتی بۆ هێنا .



# دەرزی دووەم : سەرەتای وەحی

لە ساڵی چل‌دا شەش مانگی تەواو
ڕوئیای صادیقەی لە بۆ هاتە ناو

واتە هەر خەوێ ئەیبینی بە شەو
بۆی ئەهاتەدی بە وێنەی پرتەو

بەم وەزعە دڵی زۆر نوورانی بوو
خوڵکی نەفسانی بە ڕۆحانی بوو

جا هەر لەم ساڵا مانگی رەمەزان
جبریل هاتە خوار بۆی هێنا قورئان

هاتە لای بۆ غار ئەشکەوتی (حیرا)
حیرای بۆ گۆڕا بە قەصرو سەرا

غار بە کارەبای وەحي پر نوور بوو
قەلبی بە نووری ڕەحمەت مەسروور بوو

جبریل هاتە لای باوەشی پیا کرد
بەنووری ڕەحمەت دڵێ ئاوا کرد

بە ئەدەب فەرمووی : ئەی شەخصی عەظیم
بخوێنە ، فەرمووی : من خوێندەوار نیم

دیسان وشاردی‌و ئێشی پێ گه‌یاند
به نووری قودسی دڵی پێ گه‌یاند

دووباره فه‌رمووی : ئه‌ی سیره‌ت سه‌لیم
بخوێنه . فه‌رمووی : من خوێنده‌وار نیم

ئه‌مجاره‌ش جبریل به هێزی قودسی
وشاردی‌و ئێشی گه‌یاند به شه‌خصی

ئه‌مری کرده‌وه بخوێنێ حه‌زره‌ت
ئه‌ویش وه‌ك جاران کردی مه‌عزه‌ره‌ت

جا خوێندیه‌وه جبره‌ئیل به حه‌ق
ئایاتی پێشووی سووره‌تی (عَلَق)

جا که جیبره‌ئیل غائیب بوو له غار
حه‌زره‌تیش له غار هاته‌وه بۆ شار

ئه‌و کاره‌ساته‌ی گێراوه به چین
له بۆ خه‌دیجه (أمّ المؤمنین)

ئه‌ویش به خۆشی دڵخۆشیی داوه
فه‌رمووی : مژده‌بێ له ڕووی دونیاوه

هه‌رگیز گیرۆده‌ی ناباری نابی
تووشی حاڵه‌تی بێزاری نابی

چون ئینسانێکی عالی سروشتی
ئەمین و پاك و شیرین ڕەوشتی

لە بۆ خزمان و بێگانە یەکجار
وینەی دەرمانی بۆ دەردو ئازار

فەرموو با بڕۆین بۆ لای (وەرەقە)
ذاتێکی زاناو خزمێ موشفیقە

زۆر ئاگادارە لە ئەوزاعی دین
شەرحی حاڵی تۆ ئەکا بە یەقین

جا هەردوو هەستان لە بۆ ئیستیفسار
ڕۆیشتن بۆ لای وەرەقەی هوشیار

کە حەزرەت باسی حاڵی خۆی بۆ کرد
وەرەقە جوابی داوە دەستوبرد :

ئەو شەخصە لە غار هاتوە بۆ لات
فریشتەی حەقە وا لە سەماوات

سەفیری خاصە بۆ خودای عالەم
بۆ لای ڕەهبەران ئادەم تا خاتەم

وا هاتە لای تۆیش بە خەڵاتەوە
بە فەیضی قودسی و بە ئایاتەوە

هەر ئەو شەخصەیە هاتووە ئەوسا
بۆ لای رەهبەران تا مووساو عیسا

تۆیش بووی بە رهبەر لە کائیناتا
بووی بە هۆی رەحمەت لەسەر بساتا

ئاخ لەو زەمانە کە گەلی خزمان
ئازارت ئەدەن بێ سەروسامان

گەنجێ بوومایە بەهێزو قووەت
یارمەتیم ئەدای بە بازووی هیممەت

فەرمووی : چۆن خزمان ئازارم ئەدەن
گیرۆدەی جەفای نابارم ئەکەن ؟

وەرەقە فەرمووی : بەڵێ وەهایە
لەسەر بساتا ئەمە یاسایە

قەت نەبوە کەسێ بووبێ بە رەهبەر
بێ ئازار مابێ لە شەڕی بەشبەر

لە پاش ئەم کاتە تاماوەی سێ ساڵ
وەحی قەطع بوو لە شای پڕ کەماڵ

بەڵام جوبرەئیل بۆ صەبووریی ئەو
خۆی نیشان ئەدا جار بەجار لە نەو

حەزرەتیش وەکو سالآنی پێشوو
بۆ غاری (حراء) ئەیکرد هاتوچوو

رۆژێ لە رۆژان لە غار گەراوە
جبریل بە هەیبەت خۆی نیشان داوە

بەلآم هەیئەتی پر بوو لە هیممەت
ئافاقی پڕ کرد لە نووری رەحمەت

بەم نیشان دانە سەییدی سەروەر
رژا بە سەریا ئەنواری ئەکبەر

شەپۆلی نووری دەرونی ئەنوەر
بوو بە شەپۆلی سەر دەریای ئەحمەر

بە هەر حاڵێ بوو هاتەوە بۆ ماڵ
فەرمووی : دام پۆشن بۆ ئارامی حاڵ

لەم داپۆشینا جبریلی ناصر
نازڵ بوو لەگەڵ سوورەی (مُدَّثِّر)

فەرمانی هێنا بە دەعوە بۆ دین
یەعنی تەوحیدی خودای عالەمین

لە بۆ ئەخلاق و ئادابی بەشەر
بۆ دینی موبین ببێ بە رەهبەر

له بۆ صیلەی رەحم بۆ میهرەبانی
له بۆ رەوشتی بەرزی ئینسانی

بۆ سەخاو کەرەم بۆ شەرم و شکۆ
له بۆ دڵگەرمی بە وێنەی پشکۆ

بۆ پەیمان داری بە یاسای وەفا
بۆ ئیستیقامەت ، بۆ صیدق و صەفا

جا ئەهلی مەککەو بادیەی ئەطراف
ئەوەی بەشدار بوو لە خوڵکی ئینصاف

یەك یەك و دوودوو ئەهاتن بۆ لای
موسوڵمان ئەبوون ئەبوون بە فیدای



# دەرزی دووەم بە پەخشان

کاتێ تەمەنی حەزرەت (ﷺ) گەیشتە چل ساڵی شەش مانگ پێش هاتنی جوبرەئیل ڕۆحی موبارەکی ئەوەندە نووورانی بووبوو هەر خەوێکی ئەبینی بە ساغی ئەهاتەدی ، تا ڕۆحی بەم خەوە ڕاستانەوە ئولفەتی گرت و ئامادە بوو بۆ ئەوەی کە وەحی نازڵ ببێتە سەری .

جا لەسەر عادەتی خۆی لە مانگی ڕەمەزاندا لە ئەشکەوتی حیرادا بوو کە حەزرەتی جوبرەئیل نازڵ بوو بۆ غاری حیراو ، حەزرەتی وشارد بە خۆیەوەو پێی وت : بخوێنە ، حەزرەت فەرمووی : خوێندوار نیم ، دووبارە باوەشی پیا کردەوەو وتی : بخوێنە ، دووبارە فەرمووی : خوێندەوار نیم .

تا جاری سێ یەم وشاردی یەوە بە خۆیەوەو ئەمری کرد : بخوێنە . ئەویش عوزری هێنایەوە بەوە کە نەیخوێندووە . جا بەری داو فەرمووی :

بسم الله الرحمن الرحيم . اِقْرَأْ باسم ربّكَ الذّي خَلقَ . خَلقَ الانسانَ مِنْ عَلَقٍ . اِقْرأْ وربّك الأكرَمُ . الذّي عَلَّم بالقَلمِ . عَلَّم الانسانَ مالم يَعلَمْ .

ئەم ڕووداوە لە حەقدە یا بیست و یەکی ڕەمەزاندا بوو . پاش ئەمە حەزرەت (د . خ) گەڕایەوە بۆ شاری مەککەو ئەم ڕووداوەی گێرایەوە بۆ (خەدیجەی) حەرەمی (رضي الله عنها) و فەرمووی : دڵم زۆر ئەترسێ لەم حاڵە ، نازانم ئەنجامی چۆن ئەبێ ؟

خەدیجە دلخۆشیی داوەو فەرمووی : ترست نەبێ ، تۆ ئینسانێکی سروشت پاك و سیرەت چاکی و ، خزمەتی خزم و بێگانە ئەکەی ، خودای تەعالا ئینسانی وەکو تۆ گیرۆدەی ئازارو دەردی ناهەموار ناکا .

جا (أمّ المؤمنين خەدیجە) عەرزی کرد : با بەیەکەوە بڕۆین بۆ لای (وەرەقە) ی کوڕی (نەوفەل) کە خزمی خۆی بوو ، وە ئینسانێکی پیرو

ژیرو هوشیار بوو ، له دینی حه‌زره‌تی عیسایش خه‌به‌ردار بوو .
ڕویشتن بۆ لای ، حه‌زره‌ت ڕووداوه‌که‌ی ئه‌شکه‌وتی (حراء) ی بۆ گێڕایه‌وه ، جا وه‌ره‌قه له وه‌ڵاما عه‌رزی کرد : ئه‌وه‌ی هاتووه‌ته لای تۆ له غاری (حراء) دا هه‌ر ئه‌و فریشته پیرۆزه بووه که هاتووه‌ته لای پێغه‌مبه‌رانی له‌مه‌وپێش ، وه‌کو : عیساو مووساو غه‌یری ئه‌وانیش ، موژده‌بێ پێت که خودای ته‌عالا تۆی کردووه به پێغه‌مبه‌رو ڕه‌هبه‌ر له‌ته‌ره‌ف خۆیه‌وه‌و پایه‌یه‌کی به‌رزت ده‌ست که‌وتووه ، به‌ڵام زۆر به‌داخه‌وه که من پیرم و ئه‌مرم ، ئه‌گه‌ر زیندوو بومایه له‌و کاته‌دا که خزمانی تۆ له‌سه‌ر ئه‌م وه‌زعه ئازاری دڵت ئه‌ده‌ن وئه‌یانه‌وێ ده‌رت بکه‌ن له مه‌ککه ، هه‌تا یارمه‌تی‌یه‌کی پیاوانه‌ی باشم بدایتایه .
حه‌زره‌ت (ﷺ) فه‌رمووی : بۆچی خزمه‌کانم ئازارم ئه‌ده‌ن‌و ئه‌یانه‌وێ دوورم بخه‌نه‌وه له مه‌ککه ؟ فه‌رمووی : به‌ڵێ ، هه‌رکه‌سێ وه‌کو تۆ پایه‌یه‌کی به‌رزی ڕه‌هبه‌ریی ده‌ست‌که‌وتبێ گه‌لێ ئازار دراوه .
پاش ئه‌مه ئیتر جوبره‌ئیل تا ماوه‌ی سێ ساڵ ، وه‌حیی نه‌هێنا بۆ لای حه‌زره‌ت‌و به‌م هۆوه حه‌زره‌ت زۆر دڵی په‌رێشان ئه‌بوو . به‌ڵێ جوبره‌ئیل جار به‌جار خۆی پێ نیشان‌ئه‌داو دڵی حه‌زره‌ت (د . خ) به‌وه ئارامی ئه‌گرت . پاش سێ ساڵه ، ڕۆژێ حه‌زره‌ت له غاری (حرا) وه هاته خواره‌وه بۆ مه‌ککه له ڕێگه‌دا بوو که جوبره‌ئیل به صوره‌تێکی زۆر به‌هه‌یبه‌ت خۆی پێ نیشان‌داو ، حه‌زره‌ت (د . خ) به‌م چاوپێکه‌وتنه زۆر ئه‌حواڵی گۆڕاو ، به‌هه‌ر چونێك بوو خۆی گه‌یانده ماڵه‌وه ، فه‌رمووی : دام‌پۆشن . له‌م کاتی داپۆشینه‌یا ، حه‌زره‌تی جوبره‌ئیل نازڵ بوو و چه‌ند ئایه‌تێکی له ئه‌وه‌ڵی سووره‌تی (اَلمُدَّثِّر) ه‌وه خوێنده‌وه به‌سه‌ریا ، که مه‌عنایان وایه حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د خه‌ڵاتی پێغه‌مبه‌رایه‌تی بۆ هاتووه‌و فه‌رمانی پێ دراوه که هه‌ستێ عالەم بانگ بکا بۆ خودا په‌رستی‌و بۆ خودا به یه‌ك ناسین‌و بۆ یاسای دینی ئیسلام که هۆی پیرۆزی هه‌رچی هوشیاره له جیهاندا . پاش ئه‌وه حه‌زره‌ت ده‌ستی کرد به گه‌یاندنی

ڕیساڵەت و بانگی ئەهلی مەککەو ئەطرافی مەککەی کرد بێن موسوڵمان بن ، ئەوانیش یەکە یەکەو دوو دوو ئەهاتن موسوڵمان ئەبوون .

* * *

## دەرزی سێیەم

بەر لە هەموو کەس خەدیجەی حەرەم
ئیمانی هێنا بە شاهی ئەکرەم

ئەمجار حەزرەتی بووبەکری صیددیق
ئەمجارە زەیدی خادمی عەتیق

حەزرەتی عەلی حەیدەری کەرار
هەرچەند منداڵ بوو بەساڵ نەك ڕەفتار

بیلال ، (أمّ الفضل) حەرەمی عەبباس
جا (أسماء ذات النطاقين) ی ڕاس

عوثمان و زوبەیر ، هەم (عبدالرّحمن)
جا سەعدو طەلحە شاد بوون بە ئیمان

ئەبووعوبەیدە وەلەدی جەڕاح
ئەبو سەلەمەی پڕ خێرو صەلاح

کورانی مەظعوون هەرسێ بە سەر جەم
عوثمان ، عەبدوڵلا ، قوددامەی ئەکرەم

(سعید ابن زید) لەگەڵ عەیالی
فاطیمەی خوشکی عومەری عالی

لە چل و شەشدا میر حەمزەی هومام
چوو موشەڕەف بوو بە دینی ئیسلام

ئەمجار عومەری وەلەدی خەططاب
بوو بە هێزی دڵ بۆ هەموو ئەصحاب

بۆ ئەو هات دوعای سید الكونين :
(أعزّ الاسلام بأحدِ العمرَين)

هەموو ئازاد بوون بە دینی ئیسلام
شادبوون بە پایەی ئیحسان و ئیکرام

خودا بە ئیحسان ڕازی بێ لێیان
فیردەوسی ئەعلا ببەخشێ پێیان

تا ئیستە ئیسلام شێوەی خەفی بوو
شەخصی موسوڵمان هەر نهێنی بوو

لە پاش ئیسلامی ئەمانە هەموو
نازڵ بوو : (فَاصدَعْ بِمَا تُؤمَرُ)

جا حەزرەت دەرچوو بۆ دەعوەتی عام
بێ پەردەو پەنا بۆ دینی ئیسلام

ئەمجار کافرەکان کەوتنە تەکان
بۆ ئازاردانی موسوڵمانەکان

جا حەزەت فەرمووی : موسوڵمانەکان
کۆچ بکەن بکەن بڕۆن بۆ حەبەشستان

چوون و هاتنەوەو دیسانەوە چوون
هەمووی لە ترسی کافرانی دوون

حەزرەتی رەهبەر لەگەڵ خزمانی
بە جەبری کوففار بە پەرێشانی

دەرچوون لە مەککە لەگەڵ بووطالیب
چوون لەبۆ شیعبی (بني المطلب)

پاش ماوەی دوو ساڵ هاتنەوە مەککە
هەرچەن هەر پڕ بوو لە غەدرو لەککە

لە ساڵی پەنجای تەمەنی رەهبەر
ئەبووطالیب مرد بە قەزاو قەدەر

هەروا لەم ساڵا خەدیجەی عولیا
وەفاتی فەرموو دەرچوو لە دونیا

حەزرەتی رەهبەر لەم ساڵی پەنجا
بەم ڕووداوانە زۆر دڵی ڕەنجا

خەدیجەو مامەی موتەوەفا بوون
ئەو ئەهلە هەموو دڵ پڕ جەفا بوون

لە پەنجاو یەکدا شاهی خاوەن تاج
بۆی هات خەڵاتی (إسراء) هەم (معراج)

لە مەککەوە تا (مسجد الأقصی)
ناوی ئیسرایە بە لەفظی ڕەسا

لە قودسەوە تا (مافوق السّما)
ناوی میعراجە (عندالعلما)

لە پەنجاو یەکا تا سێ بێ حەرەج
زۆر موسوڵمان بوو لە (أوس) و (خزرج)

بە هەرحاڵ هەتا ماوەی سیازدەساڵ
لە مەککەدا بوو شای خاوەن ئیقباڵ

ساڵی پەنجاو سێ کاتێ تەواو بوو
کۆچی لە مەککە ئەمری خودا بوو

بە پەنامەکی ویستیان بیکوژن
خوێنی هەیکەلی ئیسلام بڕێژن

بە وەحیی خودا بۆ دەرچوون لە جەور
لەگەڵ صیددیقا چوون بۆ غاری ثەور

ئەوەی هات بۆ غار گەڕاوە مەبهووت
بە هێلکەی کۆترو نەسجی عەنکەبووت

لە پاش سێ شەوان ئەو دڵ ئەمینە
لەگەل صیدیقا چوون بۆ مەدینە

خۆزگا ئەو گڵەی ئەو پێی نایە سەر
من ئەم کرد بە کل بۆ نووری بەصەر

هات بە دوایانا (سراقە) بە تاو
کە پێیان گەیشت ڕۆچوو لە ناکاو

سێ جار وای پێهات ئەمجا تۆبەی کرد
بە دینی ئیسلام ئیمانی هاورد

موژدەیشی پێدا شای هەردوو سەرا
بە تاج و ڕەختی پادشای کیسرا

جا گەڕایەوە دڵ پڕ لە ئەنوار
بۆ موشریکەکان کردی ئیعتیذار



# دەرزی سێیەم بە پەخشان

پاش ئەوەی کە حەزرەتی جوبرەئیل هات بۆ خزمەتی حەزرەت (ﷺ) لە غاری (حراء) داو ئەووەڵی سوورەتی (عَلَق) ی بەسەرا خوێندەوە ، ئیتر ماتڵ بوو لە وەحی هێنان ماوەی سێ ساڵو ، بەم هۆوە حەزرەت گەلێ دڵی پەرێشان ئەبوو ، بەلاّم لەم کاتی پەرێشانی یەدا جوبرەئیل خۆی نیشان ئەداو ، دڵی حەزرەت ئارامی بۆ ئەهات ، هەروا بەم حالّە تا سێ ساڵ حەزرەتیش ئاموشۆی غاری (حراء) ی ئەکرد ، هەتا جارێ لە غار دەرچوو ئەهاتەوە بۆ مەککەی موکەرەمە ، لە رێگەدا جوبرەئیل خۆی نیشاندا بە شێوەیەکی زۆر سامناكو عەجیب کە لە بەرچاویا ئەو هەوایەی پر کردبوو ، بەم نەوعە چاو پێکەوتنە زۆر دڵی سامی لێ نیشت ، هەروا هاتەوە بۆ ماڵەوە . کە گەیشتەوە ماڵ فەرمووی : دامپۆشن ، دایان پۆشی . جا لەم داپۆشینەدا جوبرەئیل نازڵ بوو ئەوەڵی سورەتی (مدّثر) ی بە سەرا خوێندەوە :

بسم الله الرّحمن الرّحيم

يا أيُّها المُدَّثر . قُمْ فأنْذِرْ . وَربَّكَ فكَبِّرْ . وثِيابَكَ فَطَهِّرْ . والرُّجْزَ فاهْجُرْ . وَلاتَمْنُنْ تَسْتكثِر .

واتە : ئەی کەسێ کە خۆت داپۆشیوە بە نوێن ، هەستە ، هۆشیارەکان بترسێنە لە عەذابی خوداو ، خودای خۆت بە گەورە بگرەو ، پۆشاکی خۆت خاوێن بکەرەوە ، دوور بکەوەرەوە لە بتەکانو لە هەر شتێ کە پیسەو ، شت مەدە بە موستەحەققانو بە زۆری بزانی . واتە : هەر ئەندازە یارمەتی یەکی داماو بدەی بە کەمی بزانەو بە زۆری مەزانە .

پاش ئەمە حەزرەت (ﷺ) دەستی کرد بە بانگکردنی خەڵك بۆ دینی ئیسلامو ، بۆ ئەوە کە خودا بە تاکو تەنیا بزانن و هەر خودا

بپەرستن ، بەڵام لەم کاتەدا هەر بە پەنامەکی خەڵکی بانگ ئەکرد .

یەکەم کەسێ ئیمانی هێنا لە پیاوانی ئازادا ئەبووبەکری صیدیق بوو ، لە ژناندا (أمّ المؤمنین خدیجة) ی کچی (خویلد) ی ئەسەدی بوو ، لە منداڵاندا عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو کە لەو کاتەدا حەوتساڵان بوو ، هەندێ کەسیش ئەڵێن دە ساڵان بوو . لە بەندە ئازادکراوەکانیش زەیدی کوڕی حاریثەو لە بەندە ئازاد نەکراوەکان بیلالی حەبەشی بوو .

پاش ئەمانە (عثمان ابن عفان) و (زبیر بن عوام) و (عبدالرحمن بن عوف) و (سعد بن أبي وقاص) و (طلحه) ی کوڕی (عبید الله) ئەمانە لە سەر بانگ کردن و یارمەتی ئەبووبەکری صیدیق هاتن ئیمانیان هێنا .

پاش ئەمان (ابو عبیده) عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەراح و (أبو سلمه) و (أرقم) ی کوڕی (أبو أرقم) ی مەخزومی و عوثمانی کوڕی مەظعون لەگەڵ دوو برای (قدّامه) و (عبدالله) و (عبیده) کوڕی حاریث کوڕی موطەلیبو ، سەعید کوڕی زەیدو ژنەکەی کە فاطیمەی خوشکی (عمر) بوو ئیمانیان هێنا .

یەکەم ژن لە پاش (ام المؤمنین خدیجه) کە ئیمانی هێنا (أم الفضل) حەرەمی عەبباس مامی پێغەمەر (ﷺ) بوو لەگەڵ ئەسمای کچی ئەبووبەکری صیدیق کە مەشهوورە بە (ذات النطاقین) .

ئیتر نازڵ بوونی وەحی گەرم بوو ، خەڵکی ژن و پیاو بە زۆری ئەهاتن ئیمانیان ئەهێناو ، تائیستە هەر بە پەنامەکی خەڵك بانگ ئەکران بۆ ئیمان هێنان بە دینی ئیسلام . پاش ئەمانە ئایەتی (فَاصْدَعْ بِمَا تُؤمَرُ وَأَعْرِض عَنِ المشركين) هاتە خوارەوە ، واتە : جامی دڵی کافرەکان بشکێنە بە گەیاندنی ئەو ئایەتانەی ئەمرت پێ کراوە بیانگەیێنی بە هۆشیاران . یا ، واتە : ئەوە دەربرە کە ئەمرت پێ کراوە بیخوێنیتەوە .

لەمەولا حەزرەت (ﷺ) بە ئاشکرا خەڵکی بانگ ئەکرد بۆ دینی ئیسلام لەم کاتەدا کە ساڵی چل و شەش بوو لە تەمەنی حەزرەت حەمزەی مامی پێغەمبەر ئیمانی هێنا . سێ ڕۆژ پاش ئەویش (عمر بن الخطاب)

ئیمانی هێنا بە هۆی دوعای حەزرەتەوە (ﷺ) کە فەرمووی : (اللّهم أعِزّ الاسلامَ بأحَدِ العمرین) واتە : خودایا عیززەت و هێز بدە بە دینی ئیسلام بە هۆی یەکێ لەو دوو عومەر ناوانە ، یەکەم عومەر ئەبولحەکەم بوو کە مەشهوورە بە ئەبووجەهل . دووەم عومەری کوڕی خەططاب بوو . ئەم عومەرەیان موسوڵمان بوو .

موشریکەکان شڵەژان و ئاگادار بوونەوە و دەستیان کرد بە ئازاردانی موسوڵمانەکان . جا حەزرەت (ﷺ) ئیجازەی فەرموو بەوانە کە تاقەتی ئازارو عەزابیان نی یە لە مەککە دەربچن و کۆچ بکەن بۆ حەبەشستان . کۆمەڵێ لە مەککەوە کۆچیان کرد . (عثمان ابن عفان) لەگەڵ حەرەمی (رقیّة) ی کچی حەزرەت (ﷺ) و زوبەیری کوڕی عەووام و عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف لەم موهاجیرانە بوون ، پاشای حەبەش زۆر ئیکرامی گرتن و دای مەزراندن . پاش موددەتێ موهاجیرەکان بیستیان کە کافرەکانی مەککە قورئانیان بیستوە و لە خوێندنەوەی سورەتی (والنَجم) دا سوجدەیان بردوە بۆ خوداو ، دونیا گۆڕاوە ، هاتنەوە بۆ مەککە ، کاتێ کە دەرکەوت کافرەکان هەر لە سەر یاسای قەدیمیانن ، دووبارە کۆچیان کردەوە بۆ حەبەشستان و لەوێ مانەوە تا حەزرەت لە مەککەوە هیجرەتی فەرموو بۆ مەدینە ، جا بە یەکجاری لە حەبەشستانەوە هاتنەوە بۆ مەدینەو لە مەدینەی منەووەرەدا لێی گردبوونەوە .

لەم لایشەوە مەککەیی یەکان لە ناو خۆیاندا بریاری پەیمانیان دا لەسەر دوورخستنەوەی حەزرەت (ﷺ) و طائیفەی (عبدالمطلب) کە یارمەتی ئەو ئەدەن و مەجبووریان کردن لە مەککە دەرچن بۆ شوێنێ کە مەشهوور بوو بە (شعب أبی طالب) و دوو ساڵ لەوێدا مانەوە ، بە زەحمەت لەوێدا رایان ئەبوارد هەتا چەند کەسێ لە خاوەن ویژدانەکان کەوتنە نێوانیان و حەزرەت و خزمەکانی یان هێنایەوە بۆ شاری مەککەو دایانمەزراندنەوە . هەر چۆنێ بێ بە زەحمەت رایان بوارد تا تەمەنی حەزرەت گەیشت بە پەنجا ساڵ . لەو ساڵا بە قەزاو قەدەری خوا

ئەبووطالیبی مامی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موتەوەفا بوو هەروا (ام المؤمنین خدیجه) ی حەرەمی ئەویش وەفاتی کرد . بەم رووداوانە حەزرەت گەلیٚ دلی نارەحەت بوو ، چونکی خەدیجە ئاسایشی ناو خیٚزان و منداڵەکانی بوو ، ئەبووطالیبی مامیشی پیاویٚکی بەشان و شکۆ بوو ، یارمەتی حەزرەتی ئەدا ، بە هەرحاڵ لەم ساڵا حەزرەت (ﷺ) ڕۆیشت بۆ شاری طائیف بۆ بانگ‌کردنی خەڵك بۆ دینی ئیسلام و ، ماوەی مانگیٚ مایەوە موبالاتیان پیٚ نەکرد ، بەڵکو زۆر ئازاری دڵیان‌دا ، جا گەرایەوە بۆ مەککەو ڕۆیشتە ماڵی (مطعم بن عدي) بۆ ئەوە کە یارمەتی بداو دەفعی بیٚحەیایی کافرەکان بکا ، ئەویش بەراستی عەهدی بۆ کرد کە ڕۆحی لەگەڵ ڕۆحیایەتی و بە هەموو جۆریٚ یارمەتی ئەدا بەو جۆرە حەزرەت مایەوە . لە ساڵی پەنجاو یەکا شەویٚ لە حەرەمی کەعبەدا بوو جوبرەئیل بە بوراقەوە هات بۆ لای و سەلامی خودای پیٚ گەیاندو دەعوەتی کرد برۆن بۆ (بيت المقدس) . لەویا خوای تەعالا گەلیٚ لە پیٚغەمبەرەکانی بە جیسمی بەرزەخی حاضرکرد پیٚشوازی‌یان لیٚکرد . تەشریفی لە (بيت المقدس) دابەزی و دوو رکات نویٚژی بۆکردن بە ئیمامەت ، پاش ئەوە خوا حافیظی لیٚکردن و بە سواریی بۆراق لەگەڵ جوبرەئیل سەرکەوت هەتا حەوت ئاسمانەکان و گەیی بە مەقامیٚ کە بە بیٚواسیطەی فریشتە کەلامی خودای ئەبیست و چەند گفتوگۆی لەگەڵا کردو ، پیٚنج فەرزەی نویٚژی بریاردا لە سەر خۆی و لە سەر هەموو ئوممەتیٚکی ئەوو گەرایەوە بۆ مەککە . لە عەینی شەوا هاتەوە شویٚنی خۆی و سبەینیٚ ئەم مەسئەلەی ئیسراو میعراجەی گیٚرایەوە بۆ ئەهلی مەککە . ئەبوبەکری صیددیق و ئەصحابەکان باوەریان پیٚ کردو ، کافرەکان زۆر گاڵتەیان پیٚ کرد لەگەڵ ئەوەش کە پرسیاری ئەحواڵی قافڵەکەی مەککەیان لیٚکرد کە ڕۆیشتبوو بۆ (قدس) و ئەویش باسی بۆ کردن و فەرمووی : لە فلان ڕۆژا ئەگەنەوە مەککەو ، وەهایش دەرچوو .

بە هەرحاڵ حەزرەت (صلی الله علیه وسلم) بە حاڵی خۆی مایەوە خەڵکی بانگ ئەکرد بۆ ئیسلامییەت . لە ساڵی پەنجاو یەك و پەنجاو دوو پەنجاو سێدا هەموو ساڵێ لە مەوسیمی حەجدا کۆمەڵێ لە ئەهلی مەدینە لەوانە کە ئەهاتن بۆ حەج ئەیبینین و بانگی ئەکردن بۆ موسوڵمان بوون و[1]. گەلێ لەوانە موسوڵمان بوون و پەیمانیان بەست ئەگەر بروا بۆ مەدینەی منەووەرە بەگیان و ماڵ یارمەتی بدەن. کافرەکانی مەککە کە ئەمەیان بیست ترسیان پەیدا کرد کە حەزرەت بروا بۆ مەدینەو دینەکەی لەوێ بڵاو بکاتەوەو لە ئەنجاما مەککەیش موسوڵمان بکا. لە (دار الندوة) گردبوونەوەو بریاریان دا لە هەر تیرەیێ یەکێ حازر ببێ و، بەهەموویان موحەممەد بکوژن، هەتا خوێنەکەی بەسەر گەلێ تیرەدا بڵاوبێتەوەو بەنی هاشم زاڵ نەبن بە سەریاندا. حەزرەتی جوبرەئیل بە ئەمری خودا وەحیی بۆ هێنا کە لە ماڵی خۆی دەرچێ. ئەویش شەو بە پەنامەکی لە ماڵی خۆی دەرچوو، ئەمریشی کرد بە (علي بن أبي طالب)ی ئامۆزای لە جێگەکەیا بنوێ و خۆی رۆیشتە دەرەوەو رۆیشت بۆ ماڵی ئەبوو بەکری صیددیق و بەیەکەوە

لە مەککە دەرچوون و لە غاری (ثور) خۆیان پەنا دا . کاتێ کافرەکان چوونە سەری و دەستیان نەکەوت کەوتنە هاتوچۆ بە شوێنیاو گەران بە ئەشکەوتەکانا ، هەتا چوون بۆ ئەشکەوتی (ثور) کە حەزرەت لەگەڵ ئەبوبەکر لەوێدا بوون . کە نزیك بوونەوە ئەبووبەکر زۆر دڵگران بوو

---

(١) لە ساڵی پەنجاو یەکدا شەش کەس لە قەبیلەی خەزرەج موسوڵمان بوون . لە ساڵی پەنجاو دوویشدا دوازدە کەس موسوڵمان بوون ، شەشیان ئەوسی و شەشی خەزرەجی و حەزرەت مەصعەبی کوری عومەیری لە گەڵا ناردن بۆ ئەوە قورئانیان نیشان بدا . لە ساڵی پەنجاو سێدا لە مەوسیمی حەجدا حەفتاو سێ لە پیاوانی ئەوسی و خەزرەجی و دوو ژن ئیمانیان هێنا و پەیمانیان بەست لە گەڵیا بۆ ئەوە تابتوانن یارمەتی بدەن و دینی ئیسلام بڵاوکەنەوەو داوایان کرد حەزرەت (ﷺ) تەشریف ببا بۆ مەدینەی مونەووەرە .

لەوە کە کافرەکان بیانگرن و بیانکوژن ، حەزرەت پێی فەرموو : زویر مەبە ، تۆ چی ئەڵێیت سەبارەت بە دووکەس کە خودای تەعالا سێ هەمیان بێت ، وەکو لە ئایەتا وارید بووە (إذ يَقولُ لصاحِبهِ لاتَحزَنْ إنَّ اللهَ مَعَنا) .

کاتێ کافرەکان تەماشایان کرد چاویان کەوت بە کۆترێ لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدا هێلانەی کردبوو . پەردەی تەنراوی جوڵایی کەرەیشیان لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا دی لە بەر ئەمە بریاریان دا کەس نەهاتووە بەم شوێنەداو ئەشکەوتەکە چۆڵەو ، بە جێیان هێشتو ، ئەمانیش رزگار بوون .

جا حەزرەت و ئەبوبەکر لە ئەشکەوتەکە دەرچوون و رێگەی قەراخی دەریایان گرتەبەرو ، بەرەو مەدینەی مونەووەرە رۆیشتن . کافرەکانیش بریاریان دا کە رێگەی مەدینەیان گرتووەو رۆیشتوون ، لە بەر ئەوە پارەیەکی زۆریان بریاردا بۆ (سراقە) ی کوری زەنیمی کەنانی بروا بە دوایاناو بیانگرێت . (سراقە) یش کەوتە دوایان و لە رێگەدا لێیان نزیك بوەوە . لە وکاتەدا دووبارە ئەبووبەکری صیددیق زۆر دڵگران بوو بە ترسی ئەوە کە (سراقە) زیان بگەیەنێ بە حەزرەت . حەزرەت لای کردەوە لە (سراقە) بە خۆی و وڵاغەکەیەوە بەعەرزا رۆیشتە خوارو هاواری کرد لە حەزرەت بۆ رزگار بوون و رزگاربوو ، دووبارە کەوتەوە شوێنیان ، دووبارە حەزرەت لای کردەوە لێی و جارێکی تر رۆیشتەوە خوار بەعەرزا هەتا سێ جار ، تا بە راستی (سراقە) حاڵی بوو کە ئەم زاتە رەهبەرەو خۆشەویستی خودایەو ئیمانی پێ هێنا ، حەزرەتیش موژدەی پێدا کە ئەصحابەی ئەو وولاتی کیسرای عەجەم ئەگرن و تاج و رەختی پاشا

ئەبێ بدرێ بە تۆ ، ئیتر (سراقە) بە راستی گۆراو گەرایەوە بۆ شاری مەککەو گەلێ عوزری هێنایەوە بۆ ئەهلی مەککەو وتی پێیان نەگەیشتم .

بەم جورە دەرچوونی حەزرەت (ﷺ) و ئەبوبەکری صیـدیق لە شاری مەککە تەواوبوو . حەزرەت (ﷺ) لەگەڵ ئەبووبەکری ڕەفیقیا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە قەصەبەی (قوبا) لە نزیکی مەدینـەی منەووەرە لەوێ دابەزین بۆ ئیسراحەت .

* * *

# دەرزی چوارەم بە هۆنراوەیی

مەنزڵ بە مەنزڵ بە یاری تەوفیق
گەیین بە مەقصەد ڕەهبەرو صیدیق

لە پێش مەدینە مەولای نوجەبا
دابەزی لەناو عەشرەتی (قوبا)

بیستو دوو ڕۆژی تەواو لەوێ بوو
جا ڕۆژی جومعە تەشریفی دەرچوو

کاتێ گەیشتە قەومی بەنی عەوف
لەوێ دابەزی هێمن بە بێ خەوف

صەد کەس حازر بوون بۆ نوێژی جومعە
بەهـ بەهـ لەو جەمعە بەهـ بەهـ لەو شەمعە

جومعەی بۆ کردن سەییدی ئەبرار
ئەباری لەسەر بارانی ئەنوار

پاش نوێژی جومعە ئەو صاحێب دینە
سواری مەرکەب بوو بەرەو مەدینە

ئەهلی مەدینە کۆمەڵی ئەنصار
برژێتە سەریان لە خواوە ئەنوار

بە دڵو بەرۆح هاتنە پێشوازی
بۆ یارمەتی دین هاتنە گیان بازی

ئەوەی مومکین بوو بکرێ بۆ نەصرەت
بە جێیان هێنا بۆ دینی حەزرەت

جا مەنزڵی گرت لای ئەبو ئەییووب
لە لای خودادا موختارو مەحبووب

لە پاش ماوەیێ ئەرزێکی کری
خەتی بناغەی مزگەوتی بری

مزگەوتێکی وای کردەوە سەر بەرز
بوو بە پیرۆزی بۆ هەموو سەر ئەرز

لەویا دەس کرا بە تەبلیغی دین
بە عیبادەتی (ربّ العالمین)

بوو بە مەدرەسەی کیتاب و سوننەت
بوو بە بارەگای ئەنواری ڕەحمەت

لە پاش چەن جیهاد بە ماوەی دەساڵ
ئیسلام گەیشتە سەربەرزی و کەماڵ

ئیسلام بوو بە نوور نووری عالەمی
لەبۆ فریشتەو جین و ئادەمی

لێرەدا دەرکەوت بۆ شەخصی وریا
دین ڕووناکی کرد سەراسەر دونیا

وَمَا أرْسَلناكَ أيّها الأمين
إلاّ رَحمةً ، أي : للعالمين

بە حوکمی قورئان لەبۆ هیدایەت
بە عەزمی حەزرەت لەسەر ڕیعایەت

بە نازڵ بوونی ئایەتی قورئان
بە تەفسیری ئەو بۆ کەشف و بەیان

کیتاب وسوننەت بوون بە ڕەهنوما
باڵێ لە عەرزاو باڵێ لە سەما

بە نەصری بەدرو بە فەتحی مەککە
حیجاز پاکۆ بوو لە گەردو لەککە

پاش ئەوە کاتی (حجة الوَداع)
دامەزرا دین و نیظام و ئەوضاع

لە عەرەفاتا نازڵ بوو (اليَوم
أكملتَ لكمْ دينَكم) ياقَوْم

کە ئەم ئایەتە بە حەق هاتە خوار
موژدەی ئیکمالی دا بە شای ئەبرار

نۆی مانگی قوربان ساڵی دەی هیجری
ڕۆژی جومعە بوو عالی بێت قەدری

عومری حەزرەتیش شەستوسێ ساڵ بوو
بۆ لیقای خودا خاوەن ئیقباڵ بوو

ئاخرِ ئایەتیشِ بۆ وەعظو تەنبیە
(واتّقُوا يَوماً تُرجَعونَ فيه)

ئەم شەممە وتمان لە سیرەت ئەلئان
موقەددیمە بوو بۆ (نووری قورئان)

ئەوەی ئەیەوێ سیرەت تێبگا
موتالای فیقهی سیرەتی بکا

(فقه السيرة) ی سەعید بۆتانی
موتاڵای خێرە بۆ موسوڵمانی

من بەسمە ئیسمی ئەو شیرین شێوە
بڵێم بە ئێوە بەم دەم و لێوە

درودی خوداو سەلامی بێ حەد
بڕژێ بە سەریا تا ڕۆژی ئەبەد

هەم لە سەر هەموو ئاڵو یارانی
هەم پەیڕەوان و فیداکارانی

* * *

پاش ئەوە کە لە (سراقە) جیابوونەوەو (سراقە) موسوڵمان بوو و گەڕایەوە بۆ مەککە ، حەزرەت لەگەڵ ئەبوبەکری صیددیق و عەبدوڵڵای کوڕی (أریقط) کە بە کرێ هێنابویان لەگەڵ خۆیان بەرەورووی مەدینە هاتن هەتا گەیشتنە خێمەی (أم معبد) ، داوای شیریان لێ کرد ، وتی : حەیوانی خاوەن شیرم لا نی‌یە ، مەگەر ئەو مەڕە پیرە بێشیرە کە لەبەر لاوازی لە ماڵەوە بەجێ ماوە ، حەزرەت فەرمووی : ئیزنت هەیە بیدۆشم ، وتی : بەڵێ . کاتێ حەزرەت دەستی هێنا بە گوانی ئەو مەڕەدا گوانەکانی پڕ بوون لە شیر ، ئەوەندە کە ئەوان تێریان لێ خواردەوەو هەندێکیشی لێ مایەوە بۆ خاوەن ماڵەکەو ئەوانیش خواردیانەوە . پاش ئەوە هەتا ئەو مەڕە مابوو هەموو ڕۆژێ ئەیان دۆشی و هەمیشە شیری تیابوو .

کاتێ حەزرەت نزیك بووەوە لە مەدینەو دەنگی سەفەرەکەی گەیشتە مەدینە ، ئەهلی مەدینە هەموو ڕۆژێ ئەڕۆیشتن بۆ پێشوازی . ڕۆژێ لەو ڕۆژانە کاتێ گەڕانەوە بۆ ماڵ یەکێ لە جوولەکەکانی مەدینە لە سەر بەرزی‌یەکەوە چاوی لە دوورەوە بە حەزرەت و جەماعەتەکەی کەوت و حاڵی بوو کە ئەوانن ، بانگی کرد لە ئەهلی مەدینەو وتی : ئەو کەسەی ئێوە ئەتانەوێ وا هات و گەیشتە بەرەوە ، خەڵکەکە هەموو ڕۆیشتن بە پێشوازی‌یەوە هەتا بە خزمەتی گەیشتن و بەحورمەت و عیزەت لە (قوبا) لە ناو تاقمی بەنی عەمری بەنی عەوفا دابەزی و زۆر خزمەتیان کردو بیست و دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە ، جا ڕۆژی جومعە لەوێ دەرچوو هات بۆ ناو بەنی سالیمی بەنی عەوف لەوێ نوێژی جومعەی کردو صەد کەس لە خزمەتیا نوێژیان کرد ، ئەمجار پاش نوێژی جومعە

بەرەو شاری مەدینەی مونەووەرە کەوتەرێ ، خەڵکی مەدینە هاتن بە ئیستیقباڵیەوەو گەلێ لەوان داوای ئەوەیان لێ کرد کە لەماڵی ئەوانا دابەزێ ، حەزرەت فەرمووی : لێگەرێن ، وشترەکە خۆی لە هەر شوێنێ نووست ئەوە مەنزڵی منە ، وشترەکەی لە بەر دەرگای ماڵی ئەبوو ئەییووبی ئەنصاریدا نووست ، جا حەزرەت ماڵی ئەبووئەییووبی کرد بە مەنزڵی موبارەکی خۆی .

پاش ماوەیێ ئەرزی جێگەی مزگەوتی ئیستەی کری و مزگەوتی پیرۆزی خۆی کردەوە کە بوو بە عیبادەتخانەی تەوحیدی پەروەردگارو مەدرەسەی کیتاب و سوننەت و حیکمەت بۆ رۆزگارو بە بارەگای فەرمانی وەحیی ئاسمانی و ئەمری رەببانی بۆ موسوڵمانان ، پێغەمبەر (ﷺ) لەوێوە دەستی کرد بە بانگکردنی عالەم بۆ دینی ئیسلام و موهاجیرەکانی حەبەشستانیش هاتنەوە بۆ مەدینەو موسوڵمانەکانی مەککە کۆچیان کرد بۆ مەدینەو ئیسلام هێزی گرت .

موهیمترین حەوادیث جەنگی بەدر بوو رووی‌داو دینی ئیسلام زۆر بەهێز بوو . هەرچەند لە واقیعەی جەنگی (أحد) دا موسوڵمانان زیانیان کرد بەڵام بوو بە هۆی سەرکەوتنی ئەدەبی و خۆ گردکردنەوە بۆ بەرابەری کردنی دژمنەکان ، پاش ئەوە حادیثەی خەندەق و فەتحی خەیبەر رووی‌دا . لە رەمەزانی ساڵی هەشتیشدا فەتحی مەککەی کردو جەنگی هەوازین و حونەین رووی‌داو ئەنجامی هەموو سەربەرزی ئیسلام بوو . لە ساڵی دەی هیجریدا حەزرەت رۆیشت بۆ حەج . ئەو حەججە مەشهوورە بە (حجة الوداع) .

رۆژی جومعە کاتێ لە عەرەفاتا راوەستابوو ئایەتی : (اليومَ أكملت لَكمْ دينَكم) نازڵ بوو ، ئیشارە بە وەفاتی حەزرەت - ﷺ . پاش گەرانەوەی بۆ مەدینەی مونەووەرە لە بیست و حەوتی مانگی صەفەردا نەخۆش کەوت و لە رۆژی دووشەممەی نۆهەمی (ربيع الأول) دا موتەوەففا بوو . رۆژی چوار شەممە[1] لە حوجرەی (أمّ المؤمنين) حەزرەتی

عائیشەدا دەفن کرا (ﷺ) . ئەمە شەمەیەك و نموونەیێ بوو لە سیـرەتی حەزرەت (ﷺ) کردم بە سەرەتا بۆ ریسالەی (نووری قورئان) کە لەمەولا دەستی پێ ئەکەین - إن شاء الله تعالی .

---

(١) لە شەرحی زەرقانی لە سەر (المواهب اللدنیـة) دا نووسـراوە مەشهـوور وایە ناساغی حەزرەت (ﷺ) لە رۆژی چوار شەمەی بیست و حەوتی صەفەردا دەستی پێ کردووە ، وە لە دوو شەمەی نۆی (ربیع الأول) دا موتەوەففابووە .



# دەرزی پێنجەم

## کەلامی خودا چەند مەعنای هەیەو مەعنای نازڵ بوونی چیە ؟

بزانن ذاتی (واجب الوجود)
حەوت صیفەتی هەن بەنصی مشهود

(حیاة) و (علم) و (إرادە) ی تەمام
(قدرة) و (سمع) و (بصر) و (کلام)

ئەم صیفەتانە هەموو قەدیمن
لازمی زاتی خودای عەظیمن

کەلام بەم مەعنا حەرف‌و صەوت نی یە
صیفەتی ذاتی خودای قودسی یە

جا وەکو ئەمە وەصفی خودایە
کەلامی لەفظیش (کلام الله) یە

لەفظیش بە وێنەی صیفەتی نەفسی
کەلامی حەققەو پیرۆزەو قودسی

کەلام مەوضووعە بۆ ئەم دوو مەعنا
بۆ نەفسی و لەفظی (کما سمعنا)

لە بۆ لەفظی یە ئینزال و تەنزیل
مەکتووب و مەخطووط قیرائەو تەرتیل

کەلامی حەققە (خالق الفَلك)
دوورە لە جین و بەشەر و مەلەك

بۆ ئەم لەفظی یە بەحوکمی ئوصوول
قەرار داروە چەن وەجهی نزوول

یەکەمین نزوول وەها مەلحووظە
بە خەت نوسراوی (لوح المحفوظ) ە

دووەمین نزوول بۆ بەرزی جیهان
هاتە خوارەوە مانگی ڕەمەزان

بیست و یەك یاخود هەژدەی ڕەمەزان
فریشتە هێنای لە بۆ ئاسمان

لە (بیت العزة) ی یەکەم ئاسمان
مایەوە هەمووی بە طوولی زەمان

سێیەمین نزوول وابوو جوبرەئیل
ئەی هێنا لە بۆ ڕەسوولی جەلیل

به بیست‌و سێ ساڵ به یاسای حاجه‌ت
قورئانی هێنا بۆ ذاتی حه‌زره‌ت

جارێ نیو ئایه‌ت جارێ یه‌ك ئایه‌ت
یا زیاتر له‌وه له‌سه‌ر ڕیعایه‌ت

پێنج ئایه‌ت یا ده یا هه‌موو سووره‌ت
وێنه‌ی (کوثر) و (اخلاص) و (تبّت)

تا نیهایه‌تی ئایاتی قورئان
هات بۆ حضووری (حبیب الرحمن)

ئه‌ووه‌ڵ نازڵی قورئانی ئه‌کره‌م
(اقْرَأ باسْمِ) بوو تا (مالم یَعلَمْ)

ئاخیریش ئایه‌ی (واتّقوا یَوماً
تُرجَعونَ فیه) لای گه‌وره‌ی قه‌وما

ئه‌م فیکره لایان گه‌لێ مه‌برووکه
باقی بیره‌کان کزو مه‌ترووکه



# دەرزی پێنجەم بە پەخشان

ذاتی پەروەردگاری (واجب الوجود) بەزمانی عەرەبی (الله) و بە کوردی (خودا) ذاتێکی ئەزەلی و قەدیمەو باقی یە ، هەر بووەو هەر ئەبێ ، قائیمی (بالذات) ەو پێویستی بە هیچ شتێ نی یە و لە هەموو شتێ بێنیازەو تاق و تەنیایەو هاو وێنەی نی یە نە لە ذاتدا ، نە لە صیفاتدا ، نە لە کردەوەدا . ئەم ذاتە حەوت صیفەتی هەیە کە بریتین لە حەیات و عیلم و ئیرادەو قودرەت و سەمع و بەصەرو کەلام ، واتە : ئەو ذاتە زیندووەو زانایەو خاوەن خواستە هەرچی بیەوێ بیکا ئەیکاو هەرچی نەوێ نایکا . تبەوانایە بەسەر هەرچی مومکیناتدا ، ئەتوانێ لە چاو تروکاندنێکا جیهان وێران بکا . شنەوایە بۆ هەموو دەنگێ . بینندەیە بۆ هەموو خاوەن رەنگ و بێ رەنگێ . کەلام و وتاری بووە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانە کە رەوانەی کردوون بۆ تەمێ کردن و ئامۆژگاریی ئادەمیزاد .

ئەم صیفەتانە وەکو ذاتی (واجب الوجود) هەر بوون و هەر ئەبن و نەبوونیان بە سەرا نایێ و مانیع نی یە بۆ ئەم صیفەتانە .

لەفظی کەلام وەکو ناوە بۆ ئەو صیفەتی ذاتی خودایە کە عیبارەتە لەوە ئافەت و مانیعێ نی یە لە بەیانی مەقصوودی خۆی ، هەروا بە کار ئەهێنرێ بۆ ئەو کەلامانەیش کە هاتوون بۆ پێغەمبەرەکان لە حەزرەتی ئادەمەوە تا حەزرەتی موحەممەدی خاتەم ، واتە لەفظی کەلام موشتەرەکی لەفظی یەو لە عورفی ئەهلی ئوصوولی دینا دانراوە بۆ ئەو صیفەتە نەفسی یە کە قائیمە بە ذاتی خوداوەو بۆ ئەم لەفظانەیش کە بە هۆی جوبرەئیلەوە نازڵ کردوون بۆ پێغەمبەران . نووسینەوەو خوێندنەوە بە پەلە یا بە شێنەیی و ، ئینزال و تەنزیل بۆ ئەم کەلامە لەفظی یە دەست ئەدا ئەنا کەلامی نەفسی لە ذاتی خوا جیا نابێتەوە . جا ئەم کەلامە لەفظی یە هەرچی هاتووە بۆ پێغەمبەران هەمووی بە فەرمانی خودا لە (لوح المحفوظ) دا مەرقوومن و بە خەتی قودرەتی نووسراون . ئەو کتێبەیش کە

کتێبی فەخری عالەم (محمد المصطفی) یە (ﷺ) ئەویش بە نەصی ئایەت بە قودرەتی خودا لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوە .

(بناء علیه) عالمانی ئوصوولی دین فەرموویانە : ئەم کەلامی خۆدایە کە ناوی قورئانە سێ نزوولی بووە ، واتە سێ هاتنەخوارەوەی بووە بە ئەمری خودای گەورە .

یەکەم نزوول ئەمەیە : کە بە خەتی قودرەت لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوە . خوا خۆی فەرموویەتی : (بَل هُوَ قرآنٌ مجَيدٌ في لَوْحٍ مَحفوظٍ)

واتە : ئەم کەلامە قورئانو خوێندراوەکەی پیرۆزو بەپایەیەو لە لەوحا پارێزراوەو ئەو نووسینەوە بۆ قورئانی ئیسلام یا بۆ باقی کتێبانی ئاسمانی وا لە عیلمی ذاتی خوداداو ئێمە نازانین بە چ شێوەیێ بووە .

نزوولی دووەم ئەمەیە : وەکو چۆن هەمووی لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوەتەوە ، هەمەوویشی بە یەك جار لە (لوح المحفوظ) ەوە وەرگیراوەو ، جوبرەئیل بە پۆلێ لە فریشتەکانەوە هێناویەتی لە ئاسمانی یەکەمدا لە شوێنێکدا کە ناوی (بیت العزة) یە داینراوەو ئامادە کراوە بۆ نازڵ کردن بۆ سەر ئەرز بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) واتە : لە ئاسمانی یەکەمیشدا نوسخەیەکی تەواوی هەیە ، وەکو لە (لوح المحفوظ) دا .

دەلیلی ئەمەیش ئایەتی خودایە : (شَهرُ رَمَضانَ الّذي أنزِلَ فيهِ القرآنُ . هدىً للنّاسِ وبَيّناتٍ مِن الهُدىٰ والفُرقانِ) واتە : مانگی رەمەزان مانگێکی پیرۆزی وەهایە کە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوارەوە بۆ ئەوە ببێ بە چرای رووناكو رێنومای پاكو حەق نیشاندەر بە هەموو ئادەمیزادو جیاکەرەوەی حەق لە بەتاڵو حەرام لە حەلاڵو راست لە لار .

هەروەها فەرموویەتی : (إنا أنزَلناهُ في لَيلةٍ مُبارَكةٍ إنّا كُنّا مُنذِرينَ) . بەراستی ئێمە قورئانمان بەجارێ ناردووەتە خوار بۆ ئاسمانی یەکەم لە شەوێکی پیرۆزداو بەراستی ئێمە ئیستەیشو لەمەوبەریش وەکو مژدەی جەزای کردەوەی باشمان داوە بە کردەوە چاکان هەروەها ئەوانەیش کە بیروباوەریان نابارەو کردەوەیان ناهەموارە ، بە ئایاتی خۆمان

له ئازارو سزای ڕۆژی پاشەڕۆژ ترساندوومانن .

هەروەها فەرموویەتی : (إنّا أنزلناهُ في ليْلةِ القَدرِ) واتە : بەڕاستی ئێمە قورئانمان بەجارێ ناردووەتە خوارەوە لە شەوێکی خاوەن پایەو خاوەن حورمەتو بەڕێزو پیرۆزدا کە خوا پەرستی لەو شەوەدا خێری زۆرترە لە خواپەرستی لە هەزار مانگدا .

نزوولی سێیەم : ئەمەیە کە لە ماوەی بیستو سێ ساڵدا بەپێی پێویست بە فەرمانی خودای تەعالا ئەو ئەندازەیە ئەمری پێ کراوە جبرەئیل لە ئاسمانی یەکەمەوە هێناویەتە خوار بۆلای حەزرەتی (محمد المصطفي - (ﷺ) وەکو خودا فەرموویەتی :

(تَبارَكَ الذّي نَزّلَ الفُرقانَ على عَبدِهِ ليَكونَ للِعالمينَ نَذيراً) واتە : گەورەیی بۆ ئەو خودایە یە کە ئەو قورئانەی وا حەق جیائەکاتەوە لە ناحەق بەمۆڵەت جوملە جوملە ناردوویەتە خوارەوە بۆسەر عەبدی خۆی کە موحەممەدە هەتا ببێتە ترسێن بۆ هۆشیارانی جیهان هەموو لە پەریو ئادەمیزاد .

هەروەها فەرموویەتی : (إنّا نحنُ نَزّلنا ألذّكرَ وإنّا لَهُ لَحافِظونَ) واتە : ئێمە بەڕاستی ئەم قورئانە کە پێویستە بە زمان بخوێنرێتەوەو بە دڵ بیری لێ بکرێتەوە بە جوملە جوملە ناردوومانەتە خوارەوە . ئێمە پارێزگارو نیگابانین بۆ ئەوە لە ئیلقای شەیتانەکانو لە کوژاندنەوەی بێدینەکانو لە ئیفسادی موفسیدەکان بیپارێزین .

ئەو زانایانە کە بیروڕایان لەسەر ئەوەیە کە ئایاتی پێشوو باسی هاتنە خوارەوەی قورئان ئەکەن بۆ سەر ئەرز ، فەرموویانە : مەبەست ئەوەیە کە دەستمان کردوە بە ناردنی قورئان بۆ سەر ئەرز لە مانگی ڕەمەزانداو لە شەوی بەڕێزی پیرۆزداو لە شەوی قەدردا ، ئیتر لازم ناکا بۆئەوە بەجارێ هەمووی هاتبێتە خوارەوە .

لە ئایاتی (إنّا نَحنُ نَزَّلنا الذكرَ) ەوە دەر ئەکەوێ هەرکەسێ بڵێت : سوورەتێ یا ئایەتێ لە قورئان نەماوە ، ئەوە درۆ ئەکا ، بەڵکو لەوانەیە بەو

گومانەو بەو وتارە کافر ببێ ، چونکە خودای تەعالا ئیعلانی کردووە کە ئێمە نیگابانی قورئانین و ئەیپارێزین .

کەلامێ خودا نیگابانی بێ
خەلاتی بەندەی میهرەبانی بێ

دەستی خائینی باش لێ ئەبرێ
سەگ لە دوورەوە با هەر بوەرێ

لە چواردە قەرنا حەرفێکی تەنیا
نەفەوتاوە لێی لە هەموو دنیا

هەروا ئەمێنێ بە پایەو مایە
ساغ و سەلامەت هەتا هەتایە

ئەم قورئانە پیرۆزە کە هاتوەتەخوار لەسەر پێویستی حەزرەت بووە بۆ وەلامی پرسیارو ، بۆ ئیرشادی هۆشیارو ، بۆ ئەحکامی دینی دیندارو ، بۆ رەهنومایی حەزرەت (ﷺ) و یارانی و ئوممەتەکەی بۆ دنیاو بۆ دین ، هەتا بە نەصصی عیبارەت یا بە ئیستینباط و ئیشارەت رەفتاری پێ بکەن . وا رێکەوتووە نیوە ئایەتێ یان یەك ئایەت یا پینج ئایەت ، وا بووە دە ئایەت ، وا بووە سوورەتێ لە سوورەتەکان هاتووەتە خوارەوەو ، هەلکەوتووە چەند لەفظێ هاتووەتە خوار بۆ تەواو کردنی مەوزووعێ کە لە پێشیا نازل بووە ، وەکو : (غیر أولی الضرر) لە ناو ئایەتی (لایستوي القاعِدونَ مِن المؤمنينَ غيرُ أولي الضَرَرِ والمجاهِدونَ في سبيلِ اللهِ بأمْوالِهِمْ وأَنْفُسِهِمْ) ئەوە لەپێشا نەبوو بەلام هەر لەعەینی ئەو شوێنەدا کە ئایەتەکە نازل بوو ئەم چەند لەفظەیشە هاتە خوارەوە بۆ ئەوە هەرکەسێ کە عوزرێکی هەبێ بۆ نەچوون بۆ جیهاد یا ماڵ صەرف نەکردن ئەجری کەم نەبێتەوە .

له تەرتیبی نازڵبوونی قورئاندا ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە لەپێشا ئەووەڵی سوورەتی (عَلَق) نازڵ بوو :

بسم الله الرحمن الرحیم
(اقرأ باسم ربِّكَ الذّي خَلَق ، خَلَق الانسانَ مِنْ عَلَق ، اقرأ وَربُّكَ الأكرمُ ، الذّي عَلَّم بالقلم عَلَّمَ الانسانَ مالَمْ يَعلَمْ) .
دوا ئایەتیش کە نازڵ بووە ئایەتی : (وَاتَّقوا يَوماً تُرجَعُونَ فيهِ إلى الله ثُمَّ تُوَفّىٰ كُلُّ نفسٍ ما كَسَبَتْ وَهُمْ لا يُظلَمونَ)ە لە سوورەتی بەقەرەدا کە ئایەتی دووصەدو هەشتاو یەکە .



## دەرزی شەشەم
## هاتنەخوارەوەی جوبرەئیل

بە دوو شێوە بوو هاتنی جوبرەئیل
عەرزو قەبوڵی ڕەهبەری جەلیل

جار جار ئاوازێ بە وێنەی جەرەس
ئەیدا لە سەمعی ڕەهبەری ئەقدەس

وەکو کارەبا ئینسانێ بگرێ
حەزرەتی ئەگرت تۆ ئەتوت ئەمرێ

هێزی کارەبای وەحیی حەق وابوو
ئارەق لە لەشی ڕەهبەر دەرئەچوو

لەم حاڵەتەدا جبریلی ئەمین
بۆی ئەخوێندەوە قورئانی موبین

فامی ئەم حاڵە شعوری ئەوێ
دڵێکی پاکی پڕ نووری ئەوێ

جاربەجارێکیش بەشێوەی ئینسان
وەکو پیاوێکی بە سیمای جوان

بە شێوەی (دحیە) خۆی ئەخستە دەر
قورئانی ئەخوێند بۆ ذاتی ڕەهبەر

(علی کلّ حال) پاش ئیلقای جیبریل
حەزرەت وەکو ئەو ئەیخویندۆ تەنزیل

بەسەر کۆمەڵێ لە موسوڵمانان
یارانی بەرزی پڕ هۆش و ئیمان

ئەوانیش بە خەت بە کردنە بەر
باش وەریان ئەگرت قورئانی ئەنوەر

# دەرزی شەشەم بە پەخشان

هێنانی وەحی لە لایەنی جوبرەئیلەوە لەسەر دوو شێوە بووە : یەکەم وابووە کە وەحی ئەهات بۆ لای حەزرەت (ﷺ) لەپێش ئەوەدا شتێ بخوێنێتەوە ئاوازەیەکی وەکو ئاوازەی جەرەس ئەهاتە گوێچکەی حەزرەتەوە (ﷺ)و بەشوێنی ئەوا هێزێکی غەیبی دڵی حەزرەتی (ﷺ) داگیر ئەکرد بەجۆرێ کە ئارەق لە ناوچاوانی موبارەکیەوە دەرئەچوو . لەم حاڵەدا جوبرەئیل هەر ئەندازەیێ لە قورئانی پێ بووە خوێندوویەتەوە بەسەر حەزرەتاو ئەویش بە موافیقی ئەو وەری گرتووەو ، لەپاش ئەوە کە ئەم وەزعە بەری داوە ئەو میقدارەی لە قورئان بەسەر ئەصحابەکاندا خوێندوەتەوە .

دووەم شێوە وابووە کە جوبرەئیل لە شێوەو سیمای (دحیە)دا کە ئینسانێکی جوان بووە دەرئەکەوت لەپێش چاوی حەزرەتا (ﷺ)و ، ئەو ئەندازە ئایەتە کە پێی بووە خوێندوویەتەوە بەسەر حەزرەتا (ﷺ) ئەویش بەتەواوی وەری گرتووەو ، پاش ئەو حاڵە خوێندوویەتیەوە بەسەر ئەصحابەکانداو ، ئەوانیش نووسیویانەتەوەو کردوویانەتەبەرو لەوانەوە گەیشتووە بە باقی حوففاظی قورئانی پیرۆزو ، هەروا بڵاوبووەتەوە لە عالەمی ئیسلامدا .

# دەرزی حەوتەم

## بۆچی قورئان بە بەش بەش هاتوەتە خوارەوە ؟

حیکمەتی زۆر بوو تەنجیمی قورئان
کە بەش بەش ئەهات بۆ شاهی عەدنان

یەکەم تەنویری دەروونی رەهبەر
لەسەر عادەتی خوێندنی بەشەر

دووەم بۆ دەفعی شەری کافران
هەر جارێ جۆرێ پێی ئەبوون حەیران

سێیەم وەڵامی پرسیارەکان
بەپێی پرسیار ئەهاتە مەیدان

چوارەم یارمەتی حافیظی قورئان
کەم کەم ئاسانەو بە جوملە گران

پێنجەم بۆ فامی غایەی بەمایە
کە ئەم قورئانە لەلای خودایە

ئەگەر کەلامی خودا نەبوایە
ئیختیلافی زۆر ئەبوو ببوایە

عەلاوە ئەگەر بە تاقە جارێ
قورئان سەراسەر ئەهاتە خوارێ

نە ئەنووسراوەو نە ئەکرایەبەر
مەخسووس بۆ قەومی بێعیلم و خەبەر

ناساغی زۆرە بۆ نەفسی نەخۆش
هەرکەس بەجۆرێ دڵی دێتە جۆش

بە موناسەبەی ئەو نەخۆشینە
وەڵامی ئینسان گەلێ شیرینە

زۆر خۆشە نەخۆش دڵی چی ئەوێ
لەسەر دڵخوازی دەوای دەس کەوێ

لەسەر کتێبێ یەك جار بێتەخوار
توهمەتی کوففار زۆرەو بێشومار

بەراستی ئەڵێم کەلامی خودا
ئەبێ وەهابێ بۆ نەشری هودا



## دەرزی حەوتەم بە پەخشان

هۆی ئەوە کە قورئانی پیرۆز بە بەش بەش هاتوەتە خوارەوە زۆرە :
یەکەم : دامەزراندنی دڵی حەزرەت بووە (ﷺ) چونکی لە تازەبوونەوەی وەحی دا و نازڵ بوونی ئایاتی قورئان بە هەموو موناسەبەیێ و هاتنی جوبرەئیل بۆ لای حەزرەت (ﷺ) لە هەر موناسەبەیەکا نووری دڵی حەزرەت (ﷺ) زیاتر ئەبوو وە خاطری جەم ئەبوو وە باوەری بە ئوصوولی یاسای خۆی بە هێزتر ئەبوو . لە واقیعدا لە هەر جارێکدا موعجیزەیەکی سەر بەخۆو هێزێکی تازەو نوێی بۆ پەیدا ئەبوو ، وەکو خودای تەعالا فەرموویەتی : (کذلك لِنُثبِّتَ بِهِ فؤادَكَ) واتە : وەها بەش بەش قورئانمان بۆ نازڵ کردی هەتا دڵی تۆ بەو وەزعە دامەزرێنین .
دووەم : ئایاتی قورئانی پیرۆز هەمیشە لە بەرانبەری شوبهەی کافرەکاندا بووەو هەر رەخنەیەكو هەر عەیبێك ئەوان دەری ببرن موناسب وایە لەو کاتەدا لە موقابیلی ئەو شوبهەوە ئایەتێ بێتە خوارەوە تا رەددەکەی باش دەربکەوێ ، وەکو خودا فەرموویەتی : (وَلا يأتونَكَ بِمَثَلٍ إلّا جئناكَ بالحَقِ وأحسَنَ تَفسيراً) واتە : نایەنە لای تۆ بە هیچ سوئاڵێکی گەورەوە لە گومانی ئەواندا ، ئیللا ئێمە جوابێکی راستی جوانترو رووناکتر لە باسەکەی ئەوانمان هێناوە بۆ تۆ بۆ جوابدانەوەی ئەوان و رەددی رەخنەکەیان .
سێیەم : وەڵامدانەوەی رەخنەی کافرەکان ، لە گەلێ جاردا یەك لە دوای یەك وەکو ئەوە وەهایە کە دژمن گەلێ جار بێتە سەرت و لە هەموو جارێکدا بدەی بە قەپۆزیاو بە نائومێدی بیگێریتە داوە بە نەوعێ کە رسواو سەر شۆری بکەی لە جیهانداو ، هێز لە دڵ و دەروونیدا نەهێڵێت و بە

جارێ ئەژنۆی بشکێنی . جا قازانج و سوودی یاسای وەها لـە هەمـوو هۆشیارێکەوە دیارە .

چوارەم : پێگەیاندنی ئوممەت بە پلەپلەو مۆڵەت و تێگەیاندنیان لە یاسای دین و ژین و ، ئاسانی نووسینەوەی پارچە پارچەکانی ئایاتی قورئانی پیرۆزو حیفظ کردنیان . ئەمە حیکمەتێکی گەورەی تێدایـە ، چونکی لەبەرکردنی کتێبی گەورە یاخود نووسینەوەی گەلێ زەحمەتـەو لە تـاقەتی گەلێ کەس دوورە بە تایبەتی بۆ ئوممەتێ کە نەخوێندەوارو بێ عیلم بن .

پینجەم : ئەوەیە کە هەموو هۆشیارێ تێبگا لەوە کە ئەم کەلامە کەلامی خودایە ، چونکی ئینسانی ژیر کە تەماشای قورئان بکا و بزانێ ئەو ئەندازەیەی کە لە ئەوەڵەوە هاتوەتە خوارو ئەوەی لە ناوەراستدا هاتووەو ئەوەی کە لە ئاخردا نازڵ بووە هەموو لە غایەو مایەدا یەك شێوەن و روویان لە یەك نیشانەیەو هەموو پارچەکانی هاو ئوسلووب و هاو سیمان ، بە دڵ باوەر ئەکا بەوە کە ئەم کەلامە کەلامی خودایە ؛ چونکی ئینسانی عادەتی کە قسەی کرد گەلێ خیلاف لە ئەووەڵ و ئاخری قسەکەیدا دەرئەکەوێ و مادام موخالەفە لە قورئاندا نی‌یە دیارە کە حەقە .

جا ئەم حیکمەتانەو گەلێ حیکمەتی تری مەعقوول هەن ئەبن بە دەلیل لەسەر ئەوە کە نازڵ‌بوونی قورئانی پیرۆز بە بەش بەش گەلێ باشترە لەوە کە بەجارێ ئەو کتێبە نازڵ ببێتە سەر حەزرەت (ﷺ) .

لەبەر حاڵی بوون لەم مەبەستانە زۆر باشە ئینسان ئەسباب و هۆی نازڵ‌بوونی هەر پارچە ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئان بزانێ هەتـا باش لـە ئامانجەکانی قورئان حاڵی ببێ .





# دەرزی هەشتەم

قورئان بە گوێرەی هاتنە خواری
بۆ شاهی ڕوسول لای ذاتی باری

ئەوەی پێش هیجرەت هاتبێتە خوار
پێی ئەڵێن مەککی لەسەر ئیعتیبار

ئەوەی پاش هیجرەت هاتوە بۆ ڕەسوول
مەدەنی ناوە بە گوێرەی ئوصووڵ

سوورەی مەدەنی قورئانی کەریم
بە ئیتتیفاقی ئەصحابی تەعلیم

بیستن (بقرة) هەم (آل عمران)
(نسا) و (مائده) واتە : سفرەی خوان

(أنفال) و (توبه) هەم (نور) و (أحزاب)
(محمد) و (فتح) بەشارەی نایاب

(حجرات) و (حديد) هەم (مجادله)
(ممتحنه) و (حشر) (جمعه) ی فاضيله

(منافقين) و (طلاق) و (تحريم)
جا سوورەتی (نصر) بۆ فەوزو تەکریم

ئەو سوورەتانەیش کە موختەلەفن
(فاتحە) و (رعد) و (رحمان) و (صف) ن

سوورەی (تغابن) هەم سوورەی (تطفیف)
(قدر) و (لم یکن) (زلزلە) ی شەریف

(إخلاص) و (فَلَق) جا سوورەتی (ناس)
بمان پارێزە خودا لە وەسواس

ئەلباقی مەککین بێ شوبهەو خیلاف
خیلافی مەروی لە ئەهلی ئینصاف

مەککی یا هەمووی تەواو مەککی یە
یا هەندێ ئایەی لە مەدەنی یە

هەروا مەدەنی بە عەینی شێوە
ساغەو تێکەڵە بیزانن ئێوە

فەرقیان زۆرە ئەم دوو بەشانە
بۆ هەر بەشێکیان هەیە نیشانە

ئایاتی مەککی باسی تەوحیدە
دەلیلی بوونی خودای مەجیدە

زۆری هەرەشەو تاوێ تەهدیدە
باسی ئاثاری قەهری شەدیدە

باسی عەذابە لە قیامەتا
باسی حیسابە لە گەڵ ئوممەتا

باسی ئوممەتی پێشووی فەوتاوە
چونکی ئازاری ڕەهبەریان داوە

بەڵام مەدەنی بە غەیری ئوسلووب
عالەم بانگ ئەکا بەرەو ڕووی مەطلووب

بە نەزاکەت و بە شێوەی نەرمی
مەگەر ناچار بێ بۆ شێوەی گەرمی

باسی تەشریعی ئەحکامی دینە
باسی عەذابێ بۆ موجریمینە

باسی جیهادەو ئەحکامی جیهاد
تەقسیمی فەیئەو غەنیمەی زیاد

ئیعدادی هێزە بەگوێرەی ئەییام
تەرغیبە لەسەر وەحدەو ئیعتیصام

باسی حورمەتە لە بۆ ئەهلی دین
چ لە ئەنصار بێ چ موهاجیرین

ئەمرە بە نوێژ و زەکات و صیام
ئەمرە بە حەججی (بیت الله) ی حەرام

پایەو مەرتەبە لە بۆ صادقان
قارو عەذابە بۆ مونافیقان

هەروا بەم یاسا لە بۆ شەخسی ژیر
فەرقیان زۆرە نایێتە تەحریر

ئەو سوورەتانە سوجدەیان تیایە
هەموویان مەککین ئایە بە ئایە

هەروا سوورەتێ (کلاّ) ی تیایە
مەککی یەو زەجری ئەهلی غەوغایە

حاڵی قورئانە ئەی برای ئەنوەر
نزوول لە حەضەر یاخود لە سەفەر

یەکەمیان زۆرە ، وێنە بۆ دووەم
سوورەتی فەتحەو ئایەی (تیمم)

هەروا نزوولی نەهاریو لەیلە
وەك نزوولی فەتح بۆ ئەو پڕمەیلە

هەروا نزوولی صەیفی و شیتایی
یەکەم ئایەتی کەلالەی دوایی

دووەم دە ئایەت لە نووری موبین
لەسەر بەرائەی (أمّ المؤمنین)

حاڵی ئیسنادی قورای سەرفەراز
موتەواتەر بێ یا ئاحادو شاذ

یا حاڵێ راجیع ئەبێ بۆ ئەلفاظ
وێنەی غەریبو حەقیقەو مەجاز

یا حاڵێ راجیع لە بۆ مەعانی
وەکو (عامّ) و (خاص علی الاتقان)

یا حاڵێ راجیع لە بۆ مەعانی
مەربووط بە ئەلفاظ (عند البیان)

وەکو فەصڵو وەصڵ ئیجازو ئیطناب
یا ئەحواڵی قەصر (بالوجه الصواب)

ئەسماو ئەلقابو ئەلفاظی موبهەم
وەربگرە وێنە لە برای ئەکرەم

یا باسی راسی (أسباب النزول)
ئەلحەق کلیله بۆ گەلێ حولوول

نووسەری قورئان حافظانی ئەو
جەمعی صیدیقو عوثمانیش لە نەو

تەرتیبی قورئان کە زۆر بە نەفعە
هەروا تەحقیقی قیرائەی سەبعە

حاڵی تەجویدە وەقف و ئیبتیدا
گەلێ نافیعن لە بۆ ئیقتیدا

هەموو ئەمانە بە تەرتیبی خاص
بەیانیان ئەکەم بە صیدق و ئیخلاص

هەندێ بەکورتی هەندێ بە تەفصیل
وەها نافیع بێ بۆ خاوەن تەحصیل



# دەرزی هەشتەم بە پەخشان

بزانن قورئان عیبارەتە لەو ئەلفاظانە کە هاتوونەتە خوارەوە بە جوبرەئیلی ئەمیندا بۆ سەر موحەممەد (ﷺ) بۆ ئەوە ببێ بە بورهان و دەلیل لەسەر راستی حەزرەتی موحەممەد (ﷺ) لەوەدا کە فەرموویەتی : پێغەمبەری خودام .

بە هۆی ئەوەوە کە کەلامێکی موعجیزەو کەس نەیتوانیوەو ناتوانێ وێنەی هەموو ئەو قورئانە یا دە سوورەتە لە سوورەتەکانی یا تاقە سوورەتێ لەوانە دابنێ و بیخوێنێتەوە ، وە ئەو کەلامە کە موعجیزە بۆ جین و ئادەمیزاد تەنیا بۆ ئەو ئیعجازە نازڵ نەبووە ، بەڵکو نازڵ بووە بۆ بەیان و نیشاندانی عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلام و ئەحکامی دین لە حەلاڵ و حەرام و سوننەت و واجب و مەکرووهـ و موباح ، وە بۆ تەنویری دڵی تابیعانی ئەو قورئانەو ئیطاعەو فەرمانبەرداری خودای گەورەی بێنیاز .

سوورەت بریتی یە لە کۆمەڵێ لەو قورئانە لای کەمی سێ ئایەتە ، ئایەتیش پارچەییکە لە کەلامی خودا جیاکراوەتەوە لە بەرو دوای خۆی ، قورئان گەلێ ئایەتی پایە بەرزی تیا هەیە وەکو ئەو ئایەتانەی باسی ذات و

صیفاتی خودا ئەکەن ، وەکو ئایەتی کورسی لە سوورەتی بەقەرەداو ، سوورەتی ئیخلاص و ، ئایەتی پایە نزمیشی تیدا هەیە وەکو کەلامی خودا کە باسی غەیری ذات و صیفات بکا ، وەکو سوورەتی فیل و سوورەتی قورەیش ، ئەم قورئانە خوێندنەوەی عیبادەتەو ، لە سەر هەر حەرفێکی دە خێرو ئیحسان هەیەو دروست نی یە بە زمانی غەیری عەرەبی بخوێنرێتەوە .

قورئان گەلێ ئەحوالی هەیە . هەندێ لەو ئەحوالانە ئەگەرێنەوە بۆ نزوول . ئەمە لە سەر دوازدە بەشە ، وەکو نزوولی لە مەککە یا لە مەدینەو ، نازڵ بوونی لە ئیقامەتا یا لە سەفەراو لە رۆژا یا لە شەواو ، لە هاویندا یا لە زستانداو ، لە کاتێکدا کە حەزرەت لە ناو جێگەدا بووە کە وەحی نزوولی کردوەو ، ئەسبابی نزوول و ئەوەی کە لە پێشدا نازڵ بووەو ، ئەوەی لە ئاخردا نازڵ بووەو ، باسی قیرائەتی موتەواتەرو ئاحاد چ مەشهوور چ غەیرە مەشهوورو قیرائاتی شاذە .

هەندێکیش لە ئەحواڵەکانی ئەگەرێنەوە بۆ سەر ئەدای قورئان لە تەلەففوظدا ، وەکو : وەقف و ئیتبیداو ، ئیمالەو مەددەو تەخفیفدان بە هەمزەو ئیدغام .

هەندێکیش لەوانە ئەگەرێنەوە بۆ سەر نەفسی لەفظەکان ، وەکو : لەفظی غەریب و مەجازو موشتەرەك و ئیستیعارەو تەشبیە . هەندێکی تریش لەو ئەحوالانە ئەگەرێنەوە بۆ سەر ئەو مەعنایانە کە پێوەندیان بە ئەحکامەوە هەیە ، وەکو : عامێك کە لەسەر عوموم مابێتەوە و عامێك کە تەخصیص کرابێ یا عامێك کە مەقصەد لەو عامە خاص بێ و ، موجمەل و موئەووەل و ، مەفهوومی موافیق و موخالیف و ، موطلەق و موقەییەدو ، ناسیخ و مەنسووخ . هەندێکی تریش لەو ئەحوالانە ئەگەرێنەوە بۆ ئەغراضێ کە پێوەندیان بە ئەلفاظەوە هەیە وەکو : فەصل و وەصل و ، ئیجازو ئیطناب و ، موساوات و قەصرو ، ئەسماو ئەلقاب و موبهەمات .

ئێمه بەکورتی لەم باسانـه نموونـەیێ ئەنـووسین بـۆ ئەوەی لـەو ئەحوالانە ئاگادار بن هەتا کاتی خۆی لە کتێبە گەورەکاندا باش بە تەفصیل وەریان بگرن .

# باسی مەککی و مەدەنی

قورئانی پیرۆز هەندێکی مەککی و هەندێکی مەدەنی یە ، لەبارەی مەقصوود بەم دوو نیسبەتەوە گەلێ قسە کراوە . زوربەی زاناکان لەسەر ئەوەن کە مەککی ئەو ئایەتانەن لە پێش کۆچ کردنی حەزرەت لە مەککەوە بۆ مەدینە نازڵ بوون ، خواه لە شاری مەککەدا هاتبنە خوار یا لە ئەطرافی مەککەدا . مەدەنیش ئەوەیە کە لە پاش کۆچ بۆ مەدینە نـازڵ بووبێ ، خواه لە شاری مەدینەدا نازڵ بووبێ یا لە شاری مەککەدا لە مەوسیمی فەتح و سالی (حجة الوداع) .

ئەو سوورەتانەی کە مەدینەیین بە ئیتتیفاق ئەمانەن : (بقرة) و (آل عمران) و (نساء) و (مائدة) و (أنفال) و (توبـة) و (نور) و (أحـزاب) و (محمـد) و (فتـح) و (حجـرات) و (حـديـد) و (مجـادلـة) و (حشـر) و (ممتحنة) و (جمعة) و (منافقين) و (طلاق) و (تحريم) و (نصر) .

ئەوانەیش کە ئیختیلافیان تێدا هەیە ، سوورەتی (فاتحة) و (رعد) و (رحمن) و (صفّ) و (تغـابن) و (تـطفيف) و (قــدر) و (لم يكن) و (إذا زلزلت) و (اخلاص) و (معوذتين) ن .

بـاقی لەم سـوورەتانـە هەمـوو . مەککـین . (مـع العلم) ئـەو سوورەتانە کە بە مەککی دانـراون هەنـدێکیان هـەموو ئـایەتـەکانیـان مەککینو ، هەندێکیان گەلێ ئایەتیان مەدەنی یە . هەر ئەو سوورەتانە کە بە مەدەنی دانراون هەندێکیان هەمووی مەدەنی یەو هەندێکیـان چەنـد ئایەتی مەککی یان تێدا هەیە . وێنەی بەشی یەکەم سوورەتی (مدثر) ە کە هـەموو ئـایەتـەکانی مـەککـین . وێنـەی بـەشی دووەمیش سـوورەتی

(أعراف) ە کە هەموو ئایەتەکانی مەککی نین ، چونکی ئایەتی : (واسْالهُمْ عَنِ القَرية الّتي كانَتْ حاضِرةَ البَحرِ) وەکو ڕیوایەت کراوە لە (قتادە)وە مەدەنی یە بەڵام غەیری (قتادە) چەند ئایەتی تریشیان بە مەدەنی داناوە ، وەکو ئایەتی (وإذ أخَذَ ربُّك منْ بَني آدَمَ) ئەڵێن ئەمانە هەموو مەدەنین . وێنەی سێیەم سووڕەتی (آل عمران) ە کە هەمووی مەدەنی یە . وێنەی چوارەم سووڕەتی (حجّ) ە ئەمە سووڕەتێکی مەدەنی یە بەڵام چوار ئایەت لەم سووڕەتەدا مەککین کە بریتین لە ئایەتی (وَما أرسَلنا منْ قَبلِكَ مِنْ رَسولٍ ولانبيٍ إلاّ إذا تَمنَّىٰ ألْقى الشَّيطانُ في أُمْنيتِهِ) هەتا ئەگاتە (عَذابُ يَوم عَقيم) . تێکرا نیشانەی سووڕەتە مەککی یەکان ئەمانەن :

یەکەم هەر سووڕەتێ لەفظی (كَلاّ) ی تێدابێ ئەوە مەککی یە . ئەم کەلیمە سی و سێ جار لە پازدە سووڕەتا واریدەو هەمووی لە نیوەی ئاخری قورئانی پیرۆزدایە . دووەم هەر سووڕەتێ ئەمر بە سوجدەی تێدابێ مەککی یە . سێیەم هەر سووڕەتێ ئەوەڵەکەی حروفی هیجائی موقەططەعەی تێدا بێ هەموو مەککین ئیللا سووڕەتی (البقرە) و (آل عمران) ئەمانە بە ئیتتیفاق لە سووڕەتە مەدەنی یەکانن . چوارەم هەر سووڕەتێ باسی سەرگوزەشتەی پێغەمبەرەکانی تێدابێ ئەوە مەککی یە ئیللا سووڕەتی (البقرە) . پێنجەم هەر سووڕەتێ لە موفەصصەلەکان بێ ئەوە مەککی یە .

نیشانەی سووڕەتە مەدەنی یەکانیش ئەمانەن : یەکەم هەر سووڕەتێ حودوودی تێدابێ یا ئەحکامی فەرزی تێدا بەیان کرابێ ئەوە مەدەنی یە . دووەم هەر سووڕەتێ باسی جیهادو دابەش کردنی دەسکەوتی غەزای تێدا بێ ئەوە مەدەنی یە . سێیەم هەر سووڕەتێ باسی مونافیقەکانی تێدا بێ ئەوە مەدەنی یە ئیللا سووڕەتی (عنكبوت) ئەوە بەتەحقیق مەککی یە ، ئیللا یازدە ئایەت لە ئەووەڵیەوە کە باسی مونافیقانە ئەوە مەدەنی یە .

# باسی ئاياتی حەضەري و ئاياتی سەفەري

حەضەری ئەو ئايەتانەن لە كاتی نیشتەجێییدا نازڵ بوون ئەمانە زۆرن . سەفەریش ئەو ئايەتانەن كە لە سەفەردا نازڵ بوون ، وەكو ئايەتی : (واتَّخِذُوا مِنْ مَقام إبْراهيم مُصَلّى) ئەمە لە سەفەری فەتحی مەككەدا يا لە سەفەری (حجة الوداع) دا ، نازڵبووە . هەروا ئايەتی : (وَأَتِمّوا الحَجَّ والعُمرةَ لله) هەر لەو سەفەرەدا هاتە خوارەوە . هەروا ئايەتی (انّ الله يأمركم ان تُؤَدّوا الأماناتِ إلى أهلها) هەر لە سەفەری (حجة الوداع) دا نازڵ بوو . ئايەتی (تيمم) يش لە سوورەتی (نساء) دا كە لە (حمراء الأسد) دا نازڵبوو لە سەفەری غەزاداو ، ئايەتی : (آمَنَ الرسولُ) لە فەتحی مەككەدا نازڵبوو . ئايەتی : (وإذا كُنْتَ فيهِمْ فَأَقَمتَ لَهُمُ الصّلوةَ) يش لە (عسفان) دا نازڵبوو لە بەينی نيوەڕۆو عەصرداو ، ئايەتی : (اليوم أكملت لكم دينكم) لە ڕۆژی جومعەدا لە عەرەفات لە سەفەری (حجة الوداع) دا نازڵبوو . هەروا سوورەتی (مائده) لە (حجة الوداع) دا نازڵبوو لە بەينی مەككەو مەدینەدا بەهۆی ڕووداوی حودەيبييەوە[1] .

# ئاياتی نەهارييەو لەيلييە

ئاياتی نەهارييە واتە ئەوانەی بە ڕۆژ نازڵبوون زۆرن‌و ، ئاياتی لەيلييە واتە ئەوانەی بە شەو نازڵبوون بە گوێرەی تەحقيق چەند ئايەتێكن . لەوانەيە ئاياتی ئاخری سوورەتی ئالی عيمران (إنَّ في خَلقِ السَّمواتِ وَالأرض) . هەروا لەوانەيە ئاياتی نازڵ لە شانی ئەوانەدا كە لە سوپای غەزای (تبوك) دوا كەوتن . هەروا لەوانەيە سوورەتی (أنعام) . طەبەراني ئەڵێ : ئەم سوورەتە بە شەو لە مەككەدا نازڵ بوو . گەلێ ئايەتی تريش بە شەو نازڵ بوون ، سيوطی (رحمه الله) لە (الاتقان) دا بەيانی كردوون .

---

(١) بو زانينی زياتر لەم بارەوە تەماشای كتێبی (اسباب النزول) ئەكرێ .

# ئایاتی صەیفی و شیتائی

بەعزە ئایەتێ لە ئایەتەکانی کەلالە کە لە ئاخری سوورەتی (نساء) ەوەن : (یَستَفْتُونَكَ قُلِ اللهُ یُفْتیکمْ فِي الكَلالَة) و ئەو ئایەتانەی لە غەزای (تبوك) دا نازڵبوونو ، ئایەتی هاوینەن . ئایاتی غەزای (خندق) یش لە سوورەی (أحزاب) دا ، لە زستانییەکانن . ئەم باسە لە ئیتقانی سیوطی دا (رحمه الله تعالی) بەدرێژی باسی کراوە . لە جوملەی ئەوئایەتانەیە کە نازڵ بوونەتە سەر حەزرەت (ﷺ) لە کاتێکدا خۆی پێچاوەتەوە بە نوێنی نوستنەوە ، فەرموودەی خودا : (واللهُ یَعْصِمُكَ مِنَ النّاسِ) . ئەمە ثابت بووە کە لە سێیەکی ئاخری شەودا نازڵ بووە . پاش نازڵبوونی ئەم ئایەتە ئیتر حەزرەت پاسەوانی رانەگرتووە .

لە ئایەتە نازڵبووەکانی کاتی نووستنە سوورەتی (کوثر) . ریوایەت کراوە لە ئەنەسەوە خوای لێ رازی بێ وتویەتی : حەزرەت (ﷺ) لەناوماندا چاوی‌نا بەیەکداو خەوی لێکەوت . لە ناکاودا بە زەردەخەنەوە چاوی کردەوەو فەرمووی : ئیستە لەم نووستنەدا سوورەتی کەوثەرم بۆ هات ، جا خوێندیەوە : (بسم الله الرّحمن الرحیم ، إنّا أعطَیناكَ الكوثر ، فَصَلِّ لِربِّك وَانَحرْ . إنَّ شانِئَكَ هو الأبتَرُ) .

# ئەووەڵ ئایەتێ کە نازڵ بووەو ئاخر ئایەتێ کە نازڵ بووە

ئەووەڵ ئایەتی نازڵبوو عیبارەتە لە ئەووەڵی سوورەتی (علق) هەتا ئاخری (عَلَّمَ الانسانَ مالَمْ یَعلَمْ) ، ئاخر ئایەتی نازڵبوویش عیبارەتە لە ئایەتی (واتَّقُوا یَوماً تُرجَعونَ فیهِ إلى الله) کە ئایەتی دوو صەدو هەشتاویەکە لە سوورەتی (البقرة) دا .

# قیرائاتی موتەواتەرەو ئاحادو شاذ

شێخی سیوطی لە ئیتقاندا فەرموویەتی جەلالوددینی بەڵقینی ئەڵێ : قیرائەت سێ بەشە : موتەواتەرە ، کە عیبارەتە لـە قیرائـاتی سەبعـەی مەشهوورە . قیرائاتی ئاحاد ، وەکـو ئەو سێ قیـرائەتـە کە زیـادن لەو حەوتە . قیرائاتی شاذە ، وەکو قیرائەتی تـابیعین ، وەکـو (أعمش) و ، (یحیی) و (ابن جبیر) .

بەڵام سیوطی فەرموویەتی : ئەم بەیانە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەو باشتر لەمە فەرموودەی (أبو الخیر ابن الجزری) یە کە لە ئەووەڵی کتێبی (النشر) ەوە فەرموویەتی هەر قیرائەتێ موافقی قەواعیدی زمانی عەرەبی بێ هـەرچەنـد موافیقی وەجهێ بێ لـە وجووهـو مـوافیق بێ بۆ یـەکێ لـە موصحەفە عوثمانی یەکانو با بە ئیحتیمالیش بێ سەنەدەکەی صەحیـح بێت ئەوە لە قیرائەتی صەحیحەیەو درووست نی یە رەد بکرێتەوەو رەوا نی یە ئینکار بکرێ ، بەڵکو داخڵی ئەحروفی سەبعەیە کە قورئانی پێ نازڵ بووەو ، واجبە لەسەر موسوڵمانان قبووڵی بکەن ، خواە مەنقوول بێت لە حەوت ئیمامەکانەوە یا لە سێ کەسە زیادەکان لە ژووری حەوتەوە ، یا لە غەیری ئەوانەوە لەو ئیمامانە کە مەقبووڵن ، هەر کاتێکیش روکنێ لەو ئەرکانانە فەوتا ئەوە ئەو قیرائەتە پێی ئەوترێ : ضەعیف ، یا شاذ ، یا باطڵ ، خواە لە حەوت ئیمامەوە ریوایەت کرابێ یا لە کـەسێکەوە کـە لەوان گەورە تر بێ . ئەم بیرە فیکرێ صەحیح و راستەو ئیمامانی خاوەن تەحقیقات لە سەلـەفو لە خـەلەف لـەسەر ئـەوەن . (صّرح بـذلك الداني ، والمكی ، والمهدوي وأبـو شامـة ؛ وهو مـذهب السلف الذی لایعرف عن أحد منهم خلافه انتهی ) .

## بۆ ئاگاداریی برادەران !

لەم بابەدا قسە زۆرەو راستەکەی ئەمەیە :

قورئان کە بریتی یە لە کەلامولّلای نازڵ بۆ سەر فەخری عالەم (ﷺ) بە هەموو ئەجزایەوە هەمووی موتەواتەرەو ، لە حەزرەتەوە تا ئیستە بە تەواتور ریوایەت کراوە بۆمان و شوبهە لە نەفسی ئەو قورئانەدا نی یە . بەلاّم قیرائەت و خوێندنەوە ئەویش هەرچی ریوایەت کراوە لە قیرائەی سەبعە هەمووی موتەواتەرە . ئەمە بکەن بە عەقیدەو باوەڕتان .



# باسی ئەو ئەحوالانە
# کە عاریضي ئەلفاظ ئەبن
# وەکو غەریبو مەجازو موشتەرەك :

غەریب ئەو ئەلفاظانەیە کە مەعناکەیان مەشهوور نەبێت ، وەکوو ، (مشکاة) کە تاقێکی وایە دیوەودەر نەبێ ، وەکو : (کفل) بەمەعنا بەش و ، (أوّاه) بە مەعنا خەفەتبارو زویرو ، (سجیل) بەمەعنا دەفتەرو ، (قسطاس) بە مەعنا تەرازوو . ئەمانە هەموو پێویستە بە موارجەعەی لوغەت بۆ تێگەیشتنی مەعناکەیانو ، تەقریبەن ئەگەن بەشەصت کەلیمە .

مەجازیش ئەو لەفظانەیە کە ئیعرابیان گۆڕاوە بە حەذفی لەفظێ یا زیادەی لەفظێ ، وەکو : (وَاسْأل القَريةَ) یانێ : أهل القريةَ ، یا (وَجاءَ ربُّكَ) أي : أمرُ ربّك ، یاخود لەفظێکە لە ئەصڵی مەعنای خۆی لادرابێ وەکو ئایەتی : (وآتوا اليتامىٰ) أي : الذين كانوا يتامىٰ في الزمان السابق .

موشتەرەکیش لەفظێکە کە دانرابێ بو چەند مەعنا وەکو : (قرء) بۆ مەعنای حەیض و طوهرو ، (مولی) بۆ مەعنای سەییدو بەندە و ، (وراء) بۆ بەرودوا .

موورادیفیش لەفظێکە هاو مەعنا بێ بۆ لەفظێکی تر ، وەکو (بحر) و (يمّ) و (رجز) و (رجس) و (وبال) و (عذاب) .

ئیستیعارەیش لەفظێکە ئیستیعمال بکرێ بۆ مەعنایەکی غەیری مەعنای خۆی لەبەر عەلاقەی موشابەهە لە بەینی ئەو دوو مەعنادا ، وەکو ئایەتی : (أوَمَنْ كانَ مَيتاً فأحيَيْناهُ) أي : ضالاً فهَدَيناه .

تەشبیهـ بە مەعنا ئەوەیە کە شتێ وێنەدار بکا بە موناسبێکی خۆی ، وەکو : (وَالذيَن كفَروا أعمالُهم كسَرابٍ بقيعةٍ يَحسَبُهُ الظمآنُ ماءً) .

عامیش لەفظێکە بە جارێ هەموو ئەفرادی مەعناکەی بگرێتەوە وەکو : (الانسان) لە ئایەتی (والعَصرِ إنّ الانسانَ لفي خُسر) ، جا ئەو

عامه یا هەر لەسەر عومومی خۆی ئەمێنێتەوە ، وەکو ئایەتە پێشووەکە ، یا تەخصیص ئەکرێ بە بەعزێ ئەفرادەوە ، وەکو ئایەتی (الله خالِقُ كلِّ شَيءٍ ) کە تەخصیص کراوە بە غەیری ذاتی خۆیەوە ، یاخود هەر لە ئەصلا مەقصەد لەو عامە فەردێکی تایبەتی یە ، وەکو ئایەتی : (الّذينَ قالَ لَهُمُ النّاسُ انّ الناسَ قدْ جَمعوا لَكُمْ فاخْشَوْهم) ئیستە ناسی یەکەم بە مەعنا شەخصێکە ناوی (نعمان) بووە کە زۆر موسوڵمانەکانی ئەترساند .

خاص موقابیلی عامە وەکو : ئەسمای ئەعلام . موجمەلیش لەفظێکە مەعنای چەند شت هەڵبگرێ وەکو ئایەتی : (واللّيلِ إذا عَسْعَسَ) ئیستە (عسْعَسَ) موجمەلە ئیحتیمالی هەیە بە مەعنا (أقبلَ) یا بە مەعنا (أدبَرَ) بێ : وەلحاصڵ کەلیماتی موشتەرەکە بە بێ قەرینە هەموو بە موجمەل دائەنرێن و ، لەگەڵ قەرینەدا بە واضیح ئەناسرێن .

موفەسسەر ئەوەیە مەعناکەی دیار بێت ، وە موعەررەف بە لامی عەهدو ئیسمولئیشارە .

مەفهووم مەعنایەکە لە سیاقی ئیستیعمالی کەلیمەیەکی تردا وەربگیرێ ، وەکو غەنەمی مەعلووفە لە موقابیلی کەلیمەی (سائمه) لە حەدیثی : (فِي الغنم السائمة زكاة) یانی مەعلووفە زەکاتی تێدا نی یە یا ئایەتی (وَحَلائِلُ أبنائِكم الذينَ مِنْ أصْلابِكُمْ) .

مەنسووخ ئایەتێکە لەفظەکەی نەمابێ وەکو : (الشيخُ والشيخةُ إذا زَنَيا فارجموهما البتّةَ) ئیستە ئەم ئایەتە لەفظی نەماوە بەڵام حوکمەکەی ماوە ، یاخود لەفظی مابێ و حوکمی نەمابێ ، وەکو ئایەتی : (لَكُمْ دينكُمْ وَلِيَ دين) کە مەنسووخە بە ئایەتی قیتال ، یا نە لەفظی مابێ و نە حوکمی ، وەکو ئایەتی ئیعتیباری دەجار شیرخواردن بۆ حەرامکردنی نیکاح کە نە لەفظەکەی ماوەو نە حوکمەکەی ، چونکی کەس ئیعتیباری زیاد لە پێنج جار ریضاعی نەکردووە .

لە ئەحواڵی ئەلفاظی قورئانە لەپاش تەرکیب عەطفی جوملە لەسەر جوملەی موناسب . ئەمە ناو ئەبرێت بە وەصڵ ، وەکو ئایەتی (إنَّ الأبرارَ

لفي نعيم وإن الفجّارَ لفي جَحيم) . يا تەرکی عەطف لەبەر مانیعیّ لە عەطف ، ئەمە ناوئەبریّت بە فەصلْ ، وەکو ئایەتی سوورەتی (هل أتاك) کە ئەفەرمویّت : (وجوهٌ يَومئذٍ خاشِعَةٌ) تا ئاخری جوملەکان لەگەڵ ئایەتی (وجوهٌ يومئذ ناعمةٌ) . ئەحکامی فەصلْ و وەصلْ زۆرەو پیّویستی بە لیّکدانەوەیە .

لە ئەحواڵی ئایاتی قورئانە ئیجازو ئیطناب و مساوات و قەصر .

ئیجاز ئەمەیە کە لەفظ بە نیسبەتیّ ئەو مەعنایە ئیفادەی ئەکا کەمتر بیّ لە میقداری موعتاد ، وەکو ئایەتی (وَلَكم في القِصاصِ حَياةٌ) .

ئیطناب ئەوەیە کە لەفظ زیاتر بیّ لە عادەت بۆ ئیفادەی مەعنا لەبەر نوکتەییّ ، وەکو ئایەتی (هيَ عَصايَ أتوكّأ عليْها وَأهُشُّ بها عَلى غَنَمي وَليَ فيها مآرِبُ اخرىٰ) کە ئەم زۆری کەلامە لەبەر لەزەت وەرگرتنە بە خیطاب و قسەکردن لەگەڵ خودادا .

مساوات ئەوەیە کە لەفظ بە نیسبەت بۆ مەعنا بە قەدەر عادەت بیّ وەکو ئایەتی : (ولا يَحيقُ المكرُ السيِّئُ إلاّ بأهلِهِ) .

قەسریش عیبارەتە لە حەصری صیفەتیّ لە مەوصووفیّکدا یا بە عەکسەوە بە یەکیّ لە کەلیماتی حەصر وەکو ئایەتی : (وما محمّدٌ إلاّ رسولٌ قد خَلَت مِنْ قبلِهِ الرّسُلُ) .

ئەسماء (یانی ناوەکان) زۆرن لە قورئاندا ، وەکو ناوی پیّغەمەرەکان کە بیست و پینج ناون ، وەکو : ئادەم ، ئیدریس ، نووح ، هوود ، صالح ، ئیبراهیم ، لووط ، ئیسماعیل ، ئیسحاق ، یەعقوب ، یووسف ، ئەیووب ، شوعەیب ، مووسا ، هاروون ، داوود ، سولەیمان ، ئیلیاس ، ئەلیەسەع ، زولکیفل ، یوونس ، ذەکەریيا ، یەحیا ، عیسا ، (محمد المصطفی علیهم الصلاة والسلام) .

لە ناوی مەلائیکەیش چوار ناوی تیّدایە ، جبرەئیل ، میکائیل ، هارووت مارووت .

لە ناوی عەبدیشدا ناوی زەیدی تیّدایە . لە غەیری ئەمانەیش

ناوی ئیبلیس ، قاروون ، طالووت ، جالووت ، لوقمان ، تـوببەع ، مەریەمی تێدایە .

لە ئەلقابدا (ذوالقرنین) و (مَسیح علیه السـلام) و فیرعـەون کە لەقەبی وەلیدی پاشای (مصر) بووە لە قورئاندا هەیە .

لە ناوی نادیاریدا : (مؤمن من آل فرعون) کە ناوی حزقیل بووە . ئەو ذاتەیش کە بە لەفظی (رجل) ناوی ئەبا لە سوورەتی یاسیندا حەبیبی کوڕی مووسای نەججار بووە ، (فتی مـوسی) یش یووشـەعی کووڕی نوونە . (رجلان) یش لە سوورەتی (مائـدە) دا یووشـەع و کالبـە . (اُمّ موسی) یش ناوی یووحانن بووە . (امرأة فرعون) یش ناوی ئاسیە بووە . (عبد) یش لە سوورەتی (الکهف) دا ناوی (خضر) بووە . (غلام) یش ناوی حەیدەر بووەو ، (ملك) یش ناوی هودەد بووە .

# دەرزی نۆیەم ئەسبابی نزوولی قورئان

نزوولی قورئان لە بۆ ئیرشادە
بۆ رەهنموونی زومرەی عیبادە

لە بۆ ئیمانە بە خودای ئەکبەر
بە فریشتەی پاك بە ذاتی ڕەهبەر

بەو کتێبانە هاتوونەتە خوار
بە ڕۆژی دوایی بە قەزای جەببار

لە بۆ شعوورە بە مەسئوولییەت
بە موحاسەبەی ڕۆژی قیامەت

بۆ نەشری خولق و ڕەوشتی بەرزە
لە بۆ ڕاسانی خەڵکی سەر ئەرزە

کە وابێ نابێ ئایاتی قورئان
بێ مەبەستی بەرز دابێ بۆ جیهان

هاتنەخواری قورئانی کەریم
هەموو حیکمەتە بۆ عەقڵی سەلیم

بەڵام تایبەتی بۆ بەعزێ ئایەت
سەبەبی هەیە لە بۆ ڕیعایەت

یا ڕووداوێکە لە سیرڕێ ئەدوێ
یا بێداربوونە تا بەشەڕ نەنوێ

یا وەڵامێکە بۆ پرسیارێ
یا بەیانێکە بۆ ئیعتیبارێ

یا بۆ تەعلیمی ئەحکامی عامە
بۆ دامەزرانی دینی ئیسلامە

یا لە بۆ زەجری شەخصی بەدکردار
لە بەدڕەفتاری و کوشتارو ئازار

لە ئیفسادی ئەرز لە بێناموسی
لە زیانی عام یا بە خصووصی

لە موسکیرات و قومارو ئەلعاب
ئەوەی حەرامە بەگوێرەی کیتاب

لە خیانەت و خواردنی حەرام
مەخسووس لە ماڵی کۆمەڵی ئەیتام

یا بۆ تەخویفە لە قارو عەذاب
یا بۆ تەلطیفە بۆ ئەجرو ثەواب

یا سەرگوزەشتەی گەلی بەدئیشە
کە لەبەر گوناهـ دەرچوون لە ڕیشە

ئەوەی کە بڵێن سەبەبی نی یە
مەقصەد سەبەب و هۆی تایبەتی یە

ئەنا (بالعموم) لەسەر ئەساسە
یانی تەوجیهی سلووکی ڕاسە

جا تەفەککورو زانستی ئەسباب
گەلێ موهیممە بۆ (أولو الألباب)

ئەمجار گوێ بگرە تا بە بڵاوی
بۆت بەیان بکەم بێ ناتەواوی



# دەرزی نۆیەم بە پەخشان

ئەسبابی نزوول‌و هاتنەخوارەوەی قورئانی کەریم بریتین لەو شتانە کە بوون بە هۆی نازڵبوونی قورئانی کەریم کەم یا زۆر . لە حەقیقەتدا قورئانی عەظیم لەبەرئەوە کە بناغـەی دینی ئیسلامـە پێویستـە بناغـەی ئـەحکامی ئیسـلامی تێدا بێت ، چ لـە ئیعتیقادو بیـرو بـاوەڕداو چ لـە کردەوەدا ، کردەوەکان ، چ لە واجیبات بن‌و چ لە سوننەت بن ، هەروا ئەبێ ئایاتی وایش ببن کە مەنعی شتی حەرام‌و مەکرووهـ بکەن . ئەگەر بە وردی بروانین هیچ ئایەتێ نی‌یە لەبەر مەبەستێ نازڵ نەبووبێ ، خواە ئێمە بیزانین یا نەی‌زانین . بەڵام لە عورفـدا ئەسبـابی نزوول بـەو سەبـەبە خصووصی‌یە تایبەتی‌یانە ئەڵێن کە بوون بە هۆی نزوولی ئایاتی قورئان ، وەکو ئەوە : یەکێ یا چەند کەسێ پرسیاربکەن لە شتێ‌و خودا وەڵامیان بداتەوە ، خوای ئەو شتە لە عیبادەت بێ وەکو نوێژ و ڕۆژوو زەکـات‌و حەج‌کردن بۆ (بیت الله) . یا شتی سوننەت بن وەکو : خێرو خێرات‌و چاکەکردن لەگەڵ خەڵکـدا ، یاخـود لە ئـومووری عیلمی بێ ، وەکـو پرسیار لە وەزعی مانگ لە ئەووەڵی مانگەوە تا ئاخر ، بـۆچی وا شکڵی ئەگۆڕێ ؟ یا ئومووری پاشەڕۆژ لە قیامەت ، یا لە ئومووری میـرات‌و پیتاڵ‌و بەشکردنەوەی بە سەر خاوەن بەشەکاندا .

دووەم ئەوەیە کارەساتێ ڕووی‌داوەو گەلێ قسەو باسی تێدا کراوە ، جـا خودای تـەعالا ئـەو باسـە بەیـان ئەکـاو ئایـەت نازڵ ئـەکاو لـەو مەوضووعەدا تەنویری موسوڵمانان ئەکا ، وەکو باسی واقیعـەی غەزای بەدرو ئوحودو باقی غەزاکانی تر .

سێیـەم باسی بـەعزە مـەوضووعی کـارێکی مـوهیم ، وەکـو : مەوضووعی (ذوالقرنین) و ئەمثالی ئەوانە .

بەڵێ لەم بەشانەدا هەرکامیان پێوەندیان بە ئـەحکامـەوە بێ زۆر پێویستە ئینسان لێیان بکۆڵێتەوەو بروانێ بۆ موناسەباتی ئەو ئەحکامە بۆئەوە

که بتوانێ ئه‌حکامی غه‌یره مه‌نصووصه له‌و ئایه‌ته ئیستینباط بکا به طه‌ریقه‌ی (دلالة الاشارة) یا (ایماء) یا (قیاس) یا غه‌یری ئه‌مانه .

ئه‌و ئایه‌تانه که له باسی سه‌رگوزه‌شته‌ی ئوممه‌ته پێشووه‌کاندا وارید بوون ئه‌وه بۆ ئه‌وه‌نه ئینسان عیبره‌ت وه‌ربگرێ له‌وانه‌وه‌و خۆی له‌و تاوانانه لابدا که ئه‌وان کردوویانه‌و به هۆیانه‌وه گورفتار بوون .

وه‌لحاصڵ قه‌ت ئایه‌تێك نه‌بووه که هۆی نازڵبوونی نه‌بێت ، به‌ڵام ئێمه ئه‌سبابی نزوولی ئایه‌ته‌کانمان کاتێ زۆر مه‌قصووده که سه‌به‌بێکی خصووصی ببێ هه‌تا فائیده‌ی لێ وه‌ربگرین و ببن به هۆی چاوکرانه‌وه‌مان بۆ ئیستینباط و زیاده ئیستیفاده له‌و ئایه‌تانه .

له ئه‌سبابی نزولدا گه‌لێ ته‌ئلیفات کراوه پێویسته بۆ ئه‌وه‌ی بی‌یه‌وێ موراجه‌عه‌یان بکات .

## ده‌رزی ده‌یه‌م
## نووسه‌رانی وه‌حیی موقه‌دده‌س

له‌سه‌ر ریوایات هه‌تا چل و دوو
کاتبی نووسه‌ر بۆ قورئان هه‌بوو

هه‌ر که‌س له‌وانه که حاضر ئه‌بوو
ئه‌و وه‌حیه ئه‌هات ئه‌ینووسیه‌وه زوو

له‌م کاتبانه چه‌ند که‌س مه‌شهوورن
خاوه‌ن مه‌قام و پایه‌ی حضوورن

چوار یارانی پاکی پێغەمبەر
بووبەکرو عومەر عوثمانو حەیدەر

عامری کوڕی فوهەیرەی زانا
(أبي بن كعب) قاریئی توانا

(ثابت بن قيس) کاتبی قورئان
هەروا یەزیدی (بن أبي سفيان)

زوبەیری کوڕی عەووامی ڕەشید
سەیفوڵلای مەسلوول (خالد بن ولید)

عەلای حەضرەمی عەمری ئیبنی عاص
عەبدوڵلای کوڕی حەضرەمی حەقناس

هەروا ئەرقەمی بن ئەبی ئەرقەم
موحەممەد ئیبنی مەسلەمەی ئەکرەم

خالیدو حیببان هەروەها ئەبان
وەلەدی سەعید کاتبی قورئان

عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای مەسلوول
وەلەدی ئوبەی وەلەدی سەلوول

موعەیقیب کوڕی ئەبو فاطم بوو
کە لە نووسیندا گەلێ فاهیم بوو

(ابن حسنه) شۆرەت شەرەحبیل
حەنظەلە کوڕی ڕەبیعی جەلیل

(زید بن ثابت) هەم (معاویه)
کاتبی وەحیی (خیر البریّة)

ئەم دوو کاتبە بۆ وەحیی عەظیم
نووسەری خاص بوون هوشیارو فەهیم

هەروا بۆ باقی نامەو مەکتووبات
حاضر بوون لە لای چرای کائینات

ئەمانە هەموو بە ئەمری حەزرەت
بە دڵ حاضر بوون لەبۆ کیتابەت

لە تەختەی داری خورمای باخەکان
یا لە تەختەی بەرد یا لە ئێسکی شان

تەسلیمیان ئەکرد بە ماڵی حەزرەت
لەوێ ئەماوە بۆ دینی ئوممەت

هەروا ئەمانە بۆ نەفسی خۆیان
ئەیان نووسیەوە بە دڵو بە گیان

بەو نەوعە رابورد زۆر بە ئیحتیرام
ڕاگیریان ئەکرد بۆ چەرخی ئەییام

تەعیینی جێگەی ئایەت لە سوورەت
ئەکرا بە ئەمری موطاعی حەزرەت

هەم بۆ جێی سوورەت لە شوێنێکی خاص
ڕیوایە هەیە لە ئیبنو عەبباس

حەزرەت ئەیفەرموو بە کاتبەکان
شوێنی تایبەتی بۆ سوورەتەکان

کاتێ (بسم الله) ئەهاتەوە خوار
لە خەتمی سوورەت ئەبوو ئاگادار

هەموو بە تەوقیف بە ئەمری خودا
جوبرەئیل ئەهات فەرمانی ئەدا

کاتێ خەبەری ئەدا بە حەزرەت
ئەویش تەبلیغی ئەکرد بە ئوممەت

خاوەن موصحەفیش هەر کەسێ بۆ خۆی
موصحەفەکەی خۆی ڕائەگرت لە بۆی

سێ کەس لەوانە موصحەفیان نووسی
نیشانیان ئەدا بە مەولای قودسی

لە لای حەزرەتدا ئەم سەر تا ئەو سەر
خوێندیانەوە بۆ مەولای ڕەهبەر

(ابن مسعود) و (زيد بن ثابت)
(أبي بن كعب) قاریئی قانیت

مەصاحیفی تر زۆر بوون لە ناوان
چ لە لای پیران چ لە لای لاوان

وەکو ئەوانە ئەهاتنە مەیدان
نەخوێنرانەوە بۆ دۆستی یەزدان

خودا رازی بێت لێیان سەراسەر
لە ئێمەیش لەبەر خاتری رەهبەر

مەقصەد ئەمەیە قورئانی کەریم
بە حەق نازڵ بوو بۆ تەمێ و تەعلیم

سوورەو ئایەت و ژمارەو تەرتیب
هەموو تەوقیفین لای خودای موجیب




# دەرزی دەیەمین بە پەخشان

حەزرەت (ﷺ) گەلێ ئیهتیمامی ئەکرد بە نووسینەوەی ئەو ئایەتانە کە نازڵ ئەبوون ؛ چونکی ئەوەی بکرێتەبەر لەوانەیە لەبیر بچێتەوە ، بەڵام ئەوەی بنووسرێتەوە ئەمێنێتەوە ، جا هەرچەند لەو چەرخەدا نووسەر کەم بوو لە وڵاتی حیجازدا ، دەوری چل و دوو کەس نووسەر لە موسوڵمانەکان لە ئەصحابەی پێغەمبەر (ﷺ) حازرئەبوون بۆ نووسینەوەی قورئان وە کاتێ هەر ئەندازەیە لە وەحی نازڵ ئەبوو بۆلای حەزرەت (ﷺ) پاش ضەبطی خۆی ئەیخوێندەوە بە سەر ئەصحابەکانداو ، ئەوانیش ئەوانەیان نووسەر بوون گورج ئەیان نووسیەوە بۆ حەزرەت و ئەیشیان نووسیەوە بۆ خۆیان .

نووسینەکەی لەسەر تەختەی سافی دار خورماو بەردی ساف و ئێسکی باڵەکەشان بوو ، جا ئەوەی بۆ حەزرەت ئەنووسرایەوە تەسلیم ئەکرا بە حەزرەت لە لای خۆی هەڵی ئەگرت و ئەوەیش بۆ خۆیان ئەنووسیەوە لە لای خۆیان ئەمایەوە .

مەشهوور لەناو ئەو نووسەرانە دا ئەم کەسانەن :

ئەبووبەکری صیددیق و عومەری کوڕی خەططاب و ، عوثمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبووطالیب و ، ئوبەییی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابیت و ثابیتی کوڕی قەیس و خالیدی کوڕی وەلیدو موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان و یەزیدی کوڕی ئەبوو سوفیان و عامری کوڕی فەهیرەو زوبەیری کوڕی عەوام و عەمری کوڕی عاص و عەلای حەضرەمی و عەبدوڵڵای کوڕی حەضرەمی و ئەرقەمی کوڕی ئەبوو ئەرقەم و موحەممەدی کوڕی سەمەو عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و موعەیقبی کوڕی ئەبوو فاطم و شەرەحبیل و حەنظەلەی کوڕی رەبیع و ئەبانی کوڕی سەعید خودایان لێ رازی بێت .

لە ناو ئەم شەخصانەدا بەتایبەتی زەیدی کوڕی ثابیت و موعاویەی

کوڕی ئەبوو سوفیان کاتبی تایبەتیی حەزرەت بوون (ﷺ) چ بۆ قورئان چ بۆ نووسینی نامە بۆ ئەطرافی عالەم .

لەمانەدا کە موصحەفی شەریفیان بۆ خۆیان نووسیبووەوە سێ کەسیان موصحەفی خۆیان لە حضووری حەزرەتدا خوێندوەتەوە ئەمانە : زەیدی کوڕی ثابیت و ئوبەیي کوڕی کەعب و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودن (رضی الله عنهم) . ئەو شێوە کە ئەوان نووسیویانەتەوە لە لای حەزرەت مەقبووڵ بووە .

## دەرزی یازدەیەم
## باسی ئەوانەی قورئانیان لەبەر بووە

لە چەرخی بەرزی حەزرەتی رەهبەر
زۆر کەس قورئانیان هەموو کردەبەر

(أبيّ بن كعب) خاوەن لەهجەی خۆش
(زيد بن ثابت) صافی بیرو هۆش

سێیەم ئەبوو زەید چوارەمین موعاذ
هەموو ئەنصارن بە قەدرو ئیعزاز

حەزرەتی عوثمان شەخصی (ذي النورين)
حەزرەتی عەلی (أبو الحسنين)

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص
عوبادەی ئیبنو صامیتی حەقناس

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی ئەکرەم
تەمیمی داری شەخصی موحتەرەم

ئەمانە هەموو بۆ هەموو قورئان
حافیظ بوون لەسەر یارمەتی یەزدان

گەلێکی تریش هەر لەبەریان بوو
بەڵام ناتەواو بەعزێکی کەم بوو

ئەم حافیظانە قورئانیان هێنا
بە دڵێکی صاف بە وێنەی مینا

قورئانیان هێنا لەبۆ تابیعین
بە تەواتوری مووجیب بۆ یەقین

هەر وەها چین چین بە پایەو مایە
هەرواش ئەمێنێ هەتا هەتایە

(نَحنُ نَزَّلنا الذّكرَ وَإنّا
لَهُ) أي : للذكر (لحافِظونا)

گەل بە گەل وێنەی گوڵباخی باخان
عەطری قورئانیان گەیاندە شاخان

بوون بە رابەری قورئانی ئەنوەر
بۆ گەلی دوایی سیلسیلەی بەشەر

هەر موهاجیرێ لەبەر ئەم وێنە
هیجرەتی ئەکرد لە بۆ مەدینە

حەزرەتی رەهبەر لە یارانی خۆی
یەکێکی ئەکرد بە موعەللیم بۆی

هەتا لە شارو لە دەشت و دەردا
لە چەرخی بەرزی ذاتی ڕەهبەردا

وەها بوو بە باو خوێندنی قورئان
دەنگی ئەداوە ماڵ و ماوایان

ئەیان کردەبەر کەلامی خودا
دڵیان پڕ ئەبوو لە نووری هودا

ئەوانیش وەها بە سۆزی جگەر
ئەیان خوێندەوە : (الله أكبر)

دەماخی دڵیان پڕ ئەبوو لە نوور
لە نووری صافی قورئانی مەنصوور

عادەت بوایێ هەڵفرین بۆمان
ئەفرین بە باڵ لە بۆ ئاسمان

یانی صەحابە ئەفرین بە باڵ
بە هێزی ئەنوار بە صەفای ئەحواڵ

ویردی زمانیان هەموو قورئان بوو
سکووت بە سەعات کاتی شەوان بوو

کاتێ دەرئەچوو قورئان لە دەمیان
ئەڕۆیی هەموو پەژارەو غەمیان

ئەوان بوون بە حەق لەسەر واتەی ڕاس
(خَيرَ أمّةٍ أخرِجَتْ للنّاس)

(رضي الله عنهم أجمعين
وَعنّا وعن كلّ التابعين)

## دەرزی یازدەیەم بە پەخشان

حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ جوبرەئیلی ئەمین ئەهاتە خوارەوە بۆ لای قورئانی بەسەردا ئەخوێندەوە بەو ئەندازەی کە خودای تەعالا ئەمری پێ کردبوو . شێوەی هێنانی جوبرەئیل بۆ وەحی وەهابووە کە : خودای تەعالا ئەمری پێ کردوە ئەو ئەندازە ئایەتە کە پێویست بووە بێتەخوارەوە وەری بگرێ لە (لوح المحفوظ) یا لە (بيت العزه) لە ئاسمانی یەکەمداو ، بەو جۆرە فەرمانی وەرگرتووە هێناویەتی و خوێندوویەتەوە بە سەر حەزرەتدا ، ئەویش بە فەیضی قودسی ڕەببانی ئەو ئایەتانەی وەرگرتووەو لە دڵیدا دامەزراوەو ، بەو شێوە کە وەری گرتووە ، لە پاش بەرزبوونەوەی جوبرەئیل خوێندوویەتەوە بە سەر ئەصحابەکاندا ئەوانیش هەرکام نەخوێندەوار بوون کردوویانەتەبەرو دەوریان کردووەتەوە بۆ ئەوە کە لەبیریان نەچێتەوە ، ئەوانەیش کە خوێندەوارو نووسەر بوون

نووسیویانەتەوە دوو جار . جارێك بۆ حەزرەت (ﷺ) و جارێك بۆ خۆیان و لەسەر نوسخەکەی خۆیان کردوویانەتەبەر . ئوبەیی کوری کەعب و زەیدی کوری ثابیت و ئەبوو زەیدو موعاذی کوری جەبەل ئەمانە لە ئەنصاری مەدینەن و ، عوثمانی کوری عەففان و عەلی کوری ئەبووطالیب و عەبدوڵلای کوری عەمری کوری عاص و عوبادەی کوری صامیت و عەبدوڵلای کوری مەسعوودو تەمیمی داری لەم کەسانەن .

ئەمانە هەموو قورئانیان لەبەر بوو .

ئوبەیی کوری کەعب و عەبدوڵلای کوری مەسعوودو زەیدی کوری ثابیت ، ئەم سێ کەسە موصحەفەکەی خۆیان نیشانی حەزرەت (ﷺ) داو بۆیان خوێندەوە . گەلێ صەحابەی تریش قورئانیان لەبەر بووە ، بەلام هەموویان نەکردبووەبەر . ئەمانە لە سەر ئەمری حەزرەت (ﷺ) قورئانیان بە موهاجیرین و ئەنصار فێر ئەکردو قورئان خوێندن وەها بوو بە ویردی زمانیان کە ئیعتیقادیان بە شتی تر نەئەکرد . ژن و پیاو ، بە تایبەتی لە بەیانیدا ، ئەوەندە قورئان خوێن زۆر بوو ماڵەکانی مەدینەی مونەووەرە لە بەر قورئان دەنگی ئەدایەوە .

وەك چۆن ئەووەڵ جار لە حەزرەتەوە قورئان گەیشت بە ئەصحابە حاضرەکان ، هەر وەها لەوانیشەوە گەیشت بە ئەصحابەکانی ترو لەوانیشەوە گەیشت بە باقی ئوممەت . هەروا چین بە چین بە قەرەباڵغێکی گەورە قورئانیان هێناوەو بلاویان کردوەتەوە بە جیهانداو قورئان نووسراوەتەوە بۆ موسوڵمانان .

ئەمانە بە ریز هاتوون ، جوبرەئیل بە ئەمری خودا قورئانی هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و پێغەمبەر بوو بە پێشەواو موعەللیمی قورئان بە کۆمەڵێکی گەورە لە ئەصحابەکانی . ئەو کۆمەڵەیش گەیاندیان بە غەیری خۆیان لە ئەصحابەو ئەو ئەصحابانەیش تەعلیمیان کرد بە تابیعین و لە تابیعینەوە هاتە خوارەوە بە تەواتوری مووجیب بۆ یەقین تا ئیستەو لە ئیستەیشەوە تا رۆژی قیامەت دایێ .

له وه‌رگرتنی قورئانی پیرۆزدا سیلسیله‌ی ئه‌سانید هه‌یه که قورئان چۆن وه‌رگیراوه‌و له گوفتارو زمانی کێوه هاتوه‌ته خواره‌وه . راگرتنی قورئان به ژماره‌ی ته‌واتور فه‌رزی کیفایه‌یه له سه‌ر ئوممه‌تی ئیسلام‌و ، ئه‌بێ له هه‌موو قه‌رنێکدا چینێ قورئان له‌به‌ر کا .

بۆ به‌قای ئیسناد بۆ دینی ئیسلام          فه‌رزه ئیجازه‌ی عوله‌مای ئه‌علام

## ده‌رزی دوازده‌یه‌م
## جه‌مع کردنه‌وه‌ی صیدیق بۆ قورئان

قورئان له ماوه‌ی ژیانی حه‌زره‌ت
هه‌موو هاته‌خوار ئایه‌ت به ئایه‌ت

سالی ئاخری ره‌هبه‌ری جه‌لیل
دوو جار خوێندیه‌وه له‌بۆ جوبره‌ئیل

مه‌عنای وه‌هابوو کیتابی ئیسلام
هه‌موو ته‌واو بوو به حوکمی عه‌للام

له‌سه‌ر ئه‌م شێوه نصوصی کیتاب
هه‌موو مه‌حفوظ بوون بۆ گه‌لی ئه‌صحاب

ئه‌خوێنرایه‌وه وه‌کو نازل بوو
له قیرائه‌تیا ئه‌نوار حاصل بوو

لە پاش وەفاتی حەزرەتی رەهبەر
صیدیق دامەزرا لە جێگەی سەروەر

هەر بەو ئوسوولە بە عەینی عادەت
قورئان دائیر بوو سوورەت و ئایەت

تا دوازدەی هیجری لە چەرخی صیدیق
جەنگی (يمامة) ڕووی‌دا بە تاقیق

لەسەر سەرۆکی کەذذابی لەعین
موسەیلەمەی پیس ناپاکی بێ دین

کە ئەبوبەکر مودافەعەی کرد
تا ئەو مەلعوونەی لە ناوا لابرد

لە ئەو جەنگەدا حافیظی قورئان
گەلێ شەهید بوون لە ئەصحابەکان

جا بۆ مانەوەی قورئانی ئەنوەر
کەوتە ئەندێشە حەزرەتی عومەر

وەختێ خۆی قورئان هەمووی نووسرابوو
بەڵام تەرتیبی خاصی نەکرابوو

چۆن نووسر بوو لەسەر دەفەی شان
یا تەختەی خورما یا لە بەردی پان

زۆر مەظەننە بوون بۆ فەناو فەوتان
ئەشکێ بەردو دار یا ئێسکی حەیوان

خۆ لەم لایشەوە حوففاظی قورئان
ئەکوژرێن بە گەل لە جەنگی جیهان

پێویستە فەرزە تەدبیرێ بکەین
بۆ حیفظی قورئان حەولێ باش بدەین

عومەر ئەمانەی گەیاندە صیددیق
پاش موناقەشە گەیین بە تەوفیق

ناردی بە دوای (زید بن ثابت)
کاتبی ئەمین حافیظ و قانیت

پاش رەددو بەدەڵ ئەویش کەوتە رێ
تا ئەم موهیممە بۆیان بێتە جێ

جا فەرمانیدا صیددیقی ئەکبەر
(زید بن ثابت) کاتبی رەهبەر

وەك عەصری حەزرەت بە حوسنی صورەت
ئایەت بە ئایەت سوورەت بە سوورەت

بە ئاگاداری یارانی کیبار
لە موهاجیرین لە گەلی ئەنصار

هەر کەس ئایاتی چەندی لەبەر بوو
یا نووسراوێ لە لای، حاضر بوو

هەمووی نووسیەوە لە چەند صەفحەی ساغ
لە پێستی پاکی پوختە بە دەباغ

داینا لە بەینی دوو لەوحی شیرین
دایە دەست بووبەکر صیددیقی ئەمین

حەزرەتی عەلی و ماباقی ڕەفیق
گەلێ مەمنوون بوون لە جەمعی صیددیق

ئەم جەمعە وێنەی (لوح المحفوظ) بوو
مەعنای حیفظی حەق لێرا مەحفوظ بوو

ئەم جەمعە کرا بە یاسای ئیثبات
بە شاهیدی ساغ دوور لە خەرافات

ئەوەی (منسوخ التلاوة) نەبوو
لەم موصحەفەدا باش گردەوەبوو

ئیجماعی ئەصحاب دامەزرا لەسەر
ئەم جەمعە بە حەق (الله أكبر)



# گرد کردنەوەی قورئانی کەریم
# لە چەرخی ئەبوبەکری صیددیقدا

لە صەحیحی بوخاری شەریفدا ریوایەت کراوە کاتێ کە جەنگی یەمامە رووی‌دا لە بەینی سوپای ئیسلام‌و کۆمەڵەی موسەیلەمەی کەذذابدا ، حەفتاوپێنج کەس لە حافیظانی قورئانی عەظیم شەهید کران . بە هۆی ئەم کارەساتەوە حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) کەوتە ترس‌و ئەندێشەوە ، ئایا ئەگەر لە چەند رووداوی تردا ژمارەیەکی تر لە حافیظانی قورئان شەهید بکرێن ئیتر ئەبێ قورئان لە سینەی کێدا بمێنێتەوەو ئەم تەختە دارو بەردو باڵەکە شانانەیش ئەگەر ونبن یا بشکێن‌و زایە ببن لە کوێ نوسخەی قورئانی کەریم وەربگرین ؟

جا بەم ئەندێشەوە رۆیشت قصەی کرد لەگەڵ ئەبوبەکری صیددیقدا (رضي الله عنه)و لە پاش موناقەشەیەکی کەم ئەبووبەکر موافەقەی عومەری کرد بۆ جەمعی قورئان و ناردی بە دوای زەیدی کوری ثابیتدا کە کاتبی وەحیی حەزرەت (ﷺ) بوو و خاوەنی موصحەفە باوەرپێکراوەکەی خۆی بوو کە عەرزی حەزرەتی کردبوو ، جا زەید هات‌و ئەویش حاضرو ئامادە بوو بۆ جەمع‌و نووسینەوەی قورئان ، ئەوەی لە ناو موصحەفی ئەصحابەدا یا لە سینەیاندا هەیە گردی بکەنەوەو بریاریان‌دا هیچ نووسراوێ وەرنەگرن هەتا دوو شاهید شەهادەت نەدا بەوە کە : ئەونووسراوە لەسەر ئەمری حەزرەت نووسراوەتەوە . جا بەم یاسایە هەر کەسێ هەرچی قورئانی لەلا بوو لە نووسراوو لە مەحفووظ تەقدیمیان کرد بە زەیدی کوری ثابیت ـ رضی الله عنه .

ئەبوو داوود ریوایەت ئەکا ئەڵێ :

ئەبوبەکری صیددیق (رضي الله عنه) ئەمری کرد کە عومەری کوری خەططاب‌و زەیدی کوری ثابیت لە دەرگای مزگەوتی پێغەمەردا (ﷺ) دانیشن بۆ وەرگرتنی قورئان لە ئەصحابەکان چ نووسراوو چ

لەبەرکراو .

لەم جەمع و گردکردنەوەدا زەیدی کوری ثابیت قەناعەتی نەدەکرد بە لەبەربوونی بەتەنها هەتا نووسراوی لەگەڵدا پەیدا ئەکرد ، بۆیە زەیدی کوری ثابیت ئەڵێ :

ئاخری سوورەتی تەوبە : (لَقَدْ جاءَكم رَسُولٌ) لەگەڵ ئایەتی دوایدا دەستم نەکەوت ئیللا لە لای ئەبو خوذەیمەی ئەنصاری ، واتە غەیری خۆم هەر ئەو لەبەری بوو و نووسیبوویشیەوە ، جا لەسەر ئەم یاسا راستە بە ئاگاداری ئەبوبەکرو عومەرو عوثمان و عەلی و ئەکابیری موهاجیرین و ئەنصار خودایان لێ رازی بێ ، لە ماوەی دوو ساڵدا تەقریبەن ئەم جەمع و نووسینەوەی هەموو قورئانە تەواو بوو ، وە لەسەر چەند پارچە پێستی دەباغ کراو هەموو قورئانیان نووسی یەوەو هەمووی لە بەینی دوو لەوحی جواندا دانراو تەسلیم کرا بە ئەبوبەکری صیددیق (رضی الله عنهم أجمعین) . لە ماوەی ژیانی ئەبوبەکردا لە لای ئەو بوو و پاش وەفاتی ئەو کەوتە لای عومەری کوری خەططاب و ، لە پاش شەهادەتی ئەویش لە لای (أمّ المؤمنین حفصه) ی کچی عومەر مایەوە هەتا زەمانی عوثمانی کوری عەففان (رضي الله عنه) .

ئەم جەمعی قورئانە لە عەهدی حەزرەتی ئەبوبەکردا زۆر مەعقوول و بەجێ بوو ، بەڵکو واجبێکی موهیممی ئیسلامی بوو جێ بەجێ کرا . گەورەکانی موهاجیرین و ئەنصار ـ بە تایبەتی حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) گەلێ دڵشاد بوون بەم کردەوە پیرۆزەی ئەوانە کە هۆی مانەوەی دەستوری ئیسلام بوو .

مومەییزاتی ئەم جەمعە چەند شتێ بوو :

یەکەم هەوڵێکی وەها درا کە مەجالی قصەی کەس نەما بۆ ئیهمال و فەوتانی بەعزێ لە قورئانی پیرۆز .

دووەم ئەوەی (منسوخ التلاوه) بوو نەیان خستە ناو قورئانەوە هەتا نەبێ بە هۆی ئیختیلاف و موشاغەبە لە ناو موسوڵمانانەدا . سێیەم

شەخصییەتی قورئان بوو بە مەوریدی ئیجماعی موسوڵمانـانو مەیـدانی نیزاع نەما لەوەدا فلان ئایـەت قورئـانە یـا قورئـان نی یە ، ئـەگەرچی هەرکەسێ موصحەفی تایبەتی خۆی بوو هەر لە لای مایەوە تا کاتی جەمعی دووەم لە لایەنی عوثمانی کوری عەففانەوە .

چوارەم لەم جەمع کردنەوەی قورئانی پیرۆزەدا پایەی ئیخلاصو دڵسۆزی ئەصحابی کیرام بـە تایبـەتی شەیخـەین (ئەبـوبەکـرو عومـەر) دەرکەوت ؛ چونکی لەگەڵ ئەوەش کە موصحەفی زەیدی کوری ثابیت لە حضووری حەزرەتدا (ﷺ) خوێنرابووەوەو قەطعەن کەمو زیادی تێدا نەبوو و لە دواپیشاندانا دوو جار حەزرەت تەقریری کردبوو ، بەڵام ئەگەر ئەم جەمعە نەبوایەو هەیئەتی کیباری ئەصحابی کیرام ئاگادار نەبوونـایە قابیل بوو بەعزێ کەس بڵێن : قورئان نـاتەواوەو گـەلێکی فەرامـۆش کراوە ، یا نە نووسراوەتەوە ، یا لە سنگی شەهیدەکانی یەمامە لـەگەڵ ئەواندا لە دەست دەرچووە . بەڵام کە ئەم جەمعە جوانە بەم تەحقیقە جێ بەجێ بوو بۆ موسوڵمانی عاقڵ شوبهە نەماوە کە قورئان تەواوە ، چونکە بە عادەت زۆر دوورە ئەم سوپا گەورە لە ئەصحابی کیرام ئاگادار نەبن لە ئایاتێ کە لە عەهدی حەزرەتدا خوێنراوەتەوە ، بە تـایبەتی ئـەوانە کـە ئیشرافی ئەم جەمعەیان کردووە لە زانا گەورەکانی ئـەصحاب بـوون . مەضموونی ئایەتی : (إنّا نَحنُ نَزَّلنا الذكرَ وإنّا لَهُ لَحافِظونَ) بەم کۆکردنەوە پیرۆزەدا دەرکەوت .



# جەمعی عوثمانی کوڕی عەففان بۆ قورئان

لە سالی سیدا بە ئەمری عوثمان
بوو بە سەر سوپا میر (عبدالرحمن)

سوپایێ گەورە لە گەلی ئەصحاب
بۆ غەزاکردن تا (باب الأبواب)

لەم سوپادا بوو حوذەیفەی یەمان
ئەمینی سیرری سەییدی عەدنان

ئیختیلاف رووی‌دا لە بەینی یاران
لە خوێندنەوەی چەند جێ لە قورئان

لە بۆ مەدینە زوو گەڕایەوە
چوو بۆ لای عوثمان نەچووە ماڵەوە

تێی گەیاند ئەگەر خیلاف بمێنێ
شان و شکۆهی ئیسلام ئەشکێنێ

چاری ئیختیلاف لەسەر قیرائەت
واجبە لەسەر خەلیفەی ئوممەت

جا عوثمان هەستا زۆر بە ئیهتیمام
بۆ پاراستنی قورئانی ئیسلام

**ڕێکی خست لوجنەی یارانی وەلی**
**لەسەر ئیشرافی حەزرەتی عەلی**

هەرچی موصحەف بوو هێنایانە ڕوو
بۆ ئیستینساخی چەن موصحەفێ زوو

لەگەڵ موصحەفی مەجموعی صیددیق
هەروا موصحەفی زەیدی پڕ تەوفیق

مەعلوومە ئەمەیش بە عەرضی ئەخیر
دوو جار لای حەزرەت گەیی بە تەقریر

جا ئەم موصحەفەو موصحەفی صیددیق
بوون بە سەرمەشقی تەوحیدو تەوفیق

ئەهلی ئەو لوجنە کە دانرابوون
چواریان مەشهوورو هەموو دوازدە بوون

(ابن الزبیر) و (سعید بن عاص)
(عبد الرحمن) ی بن حاریثی خاص

(زید بن ثابت) چوار کەسی پێشوو
قورەیشی ، زەیدیش خۆی مەدەنی بوو

بە ماوەی ساڵێ یا شتێ زیاد
حەوت نوسخە قورئان دەرچوون بۆ ئیرشاد

بە یەك صوورەت و بە یەك قیرائەت
سوورەت بە سوورەت ئایەت بە ئایەت

لەسەر تەرتیبی موصحەفەکەی زەید
بە بێ تەغییردان بێ حاشیەو قەید

بۆیە پێم وتن تەرتیبی سوورەت
وا لەسەر وەضعی تەقریری حەزرەت

چون موصحەفی زەید دوو جار لای حەزرەت
تەواو خوێنراوە پێی خۆش بوو حەزرەت

هەر بەو تەرتیبەیش حەزرەتی عوثمان
مەصاحیفی خۆی دانا بۆ جیهان

یانێ تەرتیبی ئایات و سوورەت
وەك موصحەفی زەید هات لەبۆ ئوممەت

کەس حەقی نیە لەم شێوە لادا
ئەنا خۆی ئەدا بە سەر بەلادا

(قُرانٌ مجید في لَوحٍ مَحْفوظ)
یەقین مورەتتەب مەرقوومەو مەحووظ

کە مورتتەب بێ لەوێ چۆن ئەبێ
لە لای ڕەهبەردا مورەتتەب نەبێ

مەعلووم عەرضی زەید بۆ مەولای بەشیر
بوو بە وەسیلەی تەشریف و تەقریر

(فرضاً ، جدلًا) بە ئیجتیهاد بێ
تەرتیبی سووەر دەستی ئەصحاب بێ

کە بوو بە جێگەی ئیجماعی ئوممەت
مەجال نامێنێ بۆ خاوەن تۆهمەت

(لا یجتمع أمّتي على
ضلالٍ) بەسە بۆ ئەهلی وەلا

کە نووسرانەوە ئەم حەوت نوسخانە
کران بە سەرمەشق لە ڕووی زەمانە

ڕەوانە کران طەرەف بە طەرەف
تا وەری بگرن خەلەف لە سەلەف

بۆ یەمەن ، بەحرەین لە بۆ میصر و شام
بۆ کووفە و مەککە بۆ عوثمان ئیمام

بوو بە یەك لەهجە بۆ موسوڵمانان
شێوەی نووسین و خوێندنی قورئان

(اشترى الجنّة ثلاث مرّات
هذه المرّة لجمع الآيات)

بەم کردەوەیە حەیدەری کەرار
گەلێ مەمنوون بوو لە عوثمانی یار

هەروا ماباقی زانای ئەصحابان
گەلێ مەسروور بوون بە جەمعی عوثمان

هەموو رازی بوون تەوحید بنوێنن
موصحەفی خۆیان زوو بسووتێنن

چونکی هەر خێرێ لە لای ئەوان بوو
لە مەصاحیفی عوثمانا جەم بوو

حەتتا موصحەفی حەیدەری کەرار
موصحەفی ئیبنو مەسعوودی موختار

بە ئەمری خۆیان زوو شۆرانەوە
بۆ دەفعی خیلاف هیچ نەمانەوە

مەزایای جەمعی حەزرەتی عوثمان
بە چەن دەلیلێ ڕووناکە بۆمان

یەکەم ئەمە بوو هەرچی زانرا
موتەواتەرە ئەوە نووسرا

دووەم (منسوخ التلاوە) ی قورئان
هیچ نەمایەوە لە جەمعی عوثمان

سێیەم تەفسیرو تەقییدی ئەصحاب
هەرچی بوو لاچوون لە ئەصڵی کیتاب

چوارەم تەرتیبی ئایەت و سوورەت
هاتووە بەم شێوە هەیە لای ئوممەت

پێنجەم ئەو جەمعە بە حەق جامیع بوو
لە بۆ قیرائات بە هەر وەجهێ بوو

چۆن نوختەو ئیعراب نەبوو لە ناوا
باش دەستی ئەدا بۆ هەموو قوڕڕا

بەڵێ بۆ شوێنێ ئیمکانی نەبێ
بە لەفظی واحید ئیکتیفا بکرێ

تەوزیعی ئەکرد بە گوێرەی موصحەف
هەر قیرائەتێ بۆ بەعزێ طەرەف

هەزاران رەحمەت بۆ ڕۆحی عوثمان
هەم ئال و یاران تا ئاخر زەمان

ئاخ هەر خیلافێ ئەهاتە وڵات
بە وێنەی ئەمە ڕیشەی دەرئەهات

ئیسلام دوژمنە لە بۆ ئیختیلاف
دۆستە بۆ ڕاستی و یەکێتی و ئینصاف

با (رسم الخط) ی موصحه‌فی عوثمان
بمێنێته‌وه تا ئاخر زه‌مان

ده‌خیل صه‌د ده‌خیل نه‌که‌ونه خه‌یاڵ
بۆ گۆڕینی خه‌ت بکه‌ونه ضه‌لال

ره‌سمی خه‌ط سه‌دده کاتێ که شکا
لافاوی نه‌گبه‌ت عاله‌مێ ئه‌با

با هه‌ر به‌و له‌هجه له‌سه‌ر هاته‌خوار
به‌و شێوه خه‌طته گرتی ئیستیقرار

بمێنێته‌وه هه‌تا هه‌تایه
مایه‌ی مانه‌وه‌ی دینی خودایه

خودا ته‌وفیقمان بدا بۆ خزمه‌ت
تا بگا پێمان شه‌پۆلی ره‌حمه‌ت

له زه‌مانی خه‌لافه‌تی حه‌زره‌تی عوثماندا (رضی الله عنه) فتووحات زۆر بوو و عاله‌مێکی زۆر داخلی دینی ئیسلام بوون . جا له‌به‌ر ئه‌وه که قورئان ده‌ستووری دینی ئیسلامه قوتابخانه‌ی زۆر کرایه‌وه بۆ خوێندنی قورئان‌و ، له‌به‌ر ئه‌وه ئه‌صحابه گه‌وره‌کان که (مقرئ) بوون‌و ته‌علیمی موسوڵمانانیان ئه‌کرد هه‌رکام له‌هجه‌و قیرائه‌تی تایبه‌تییان بوو ، ئیختیلاف له ته‌علیمی قورئاندا په‌یدا بوو ، بۆ وێنه ئه‌هلی شام به قیرائه‌تی ئوبه‌ییی کوڕی که‌عب‌و ئه‌هلی کووفه به قیرائه‌تی عه‌بدوڵڵای کوڕی مه‌سعوودو ئه‌هلی به‌صره به قیرائه‌تی ئه‌بوو موسای ئه‌شعه‌ری (رضی الله عنهم)

قورئانیان ئەخوێند ، حەتتا لە نەفسی مەدینەی مونەووەرەدا ئیختیلاف لە تەعلیم و قیرائەتدا پەیدا بوو . کە حەزرەتی عوثمان لەم ئیختیلافە ئاگادار بوو لە خوطبەدا مەنعی موسوڵمانانی کرد لەم ئیختیلافەو فەرمووی : ئەم ئیختیلافە باش نی‌یەو ئێوە مادام لە بەر چاوی مندا ئیختیلاف بکەن ئەبێ خەڵکی شارە دوورەکان ئیختیلافیان زۆرتر بێ و ئەمەیش ئەبێ بە هـۆی تێکچوونی عالەمی ئیسلام و لەم وەزعە زۆر دڵی موتەئـەثیرو پـەرێشان بوو .

لە لایەکی تریشەوە حوذەیفەی کوڕی یەمان کە لـە ناو سـوپای جەبهەی شیمـالدا بـوو و لە مـەنطیقـەی (باب الأبـواب) قەرارگـایان کردبوو ، تەماشای کرد ئیختیلافێکی ناباری لە ناو ئەصحابەکاندا بینی ، ئەگەر خودا رەحمی نەکردایە ئەبوو بە فیتنەو ئاشووبێکی نابارو ناهەموار ، کە هاتەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە هەر کە گەیشتە بەرەوە نەرۆیشتە ماڵی خۆی و لە پێشاندا رۆیشتە خزمەتی حەزرەتی عوثمان و کارەساتی ئیختیلافی ئەصحابەکانی بۆ گێرایەوە هەتا عەرزی کرد : ئەگەر چاری ئەم وەزعە نەکرێ ئەنجامی زۆر خراب ئەبێ و تـا مەسـەلەکـە زۆر گەورە نـەبووە پێویستە چار بکرێ .

حەزرەتی عوثمـان راوێژی کـرد بە پیـاوە زاناکـانی موهـاجیرین و ئەنصارو بریاریان دا هەموو موسوڵمانان گردببنەوە لەسـەر یەك شێـوە لە خوێندنی قورئانداو ، لەسەر ئەم راوێژە لوجنەیەکی پێکەوەنا لە دوازدە کەس و حەزرەتی عەلی (کرم الله وجهه) ی کرد بە موشریف لەسەر ئەو لوجنەیە ، لەم دوازدە کەسەدا : عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو سەعیدی کوڕی عاص و عەبدولرەحمانی کوڕی حاریثی هیشامی و زەیدی کـوڕی ثابیت کاتبی وەحیی مەشهوورن .

پاش ئەمە حەزرەتی عوثمان ناردی بۆ خزمەتی (امّ المؤمنین حفصە) حەرەمی حەزرەت (ﷺ) و کچی عومەری کوڕی خەططاب (رضي الله عنە) ئەو موصحەفە کە وەختی خۆی ئەبووبەکری صیددیق ئەمری کردبوو

جەمعی قورئان کراو نووسی یانەوە ، هێنایان ، هەروا موصحەفی زەیدی کوڕی ثابیت کە دوو جار عەرزی حەزرەت کرابوو و حەزرەت لێی رازی بوو ئەویشیان هێنا ، هەروا مەصاحیفی باقی ئەصحابەکانیش حازر کران . لوجنەکە بریاریان‌دا هەرچی بنووسنەوە نیشانی ئەصحابە گەورەکانی بدەن تا شەهادەت بدەن کە حەزرەت (ﷺ) وەهای خوێندووەتەوە ئەو جار بینووسنەوە ، هەروا بریاریان‌دا لەسەر ئەمری عوثمان کە لە وجووهی قیرائاتدا ئەوەی بە یەك (رسم الخط) بە بێ نوختەو ئیعراب قابیل بێ بۆ هەموو قیرائەتەکان وەکو : (فَتَبَيَّنوا) لەگەڵ : (فتثبتوا) لە سوورەتی (الحجرات) دا ، ئەوە بە رەسمی خۆی بنووسنەوە ، چونکە بۆ هەردوو قیرائەتەکە دەست ئەدا . ئەوەیش کە قابیلی هەموو قیرائەتەکان نی‌یە لە موصحەفی ئیمامدا کە لەلای حەزرەتی عوثمان لە مەدینە مایەوە لەسەر لەهجەی قورەیش بینووسن‌و لەهجەکەی‌تر لە بەعزێ لە موصحەفەکانی تردا بنووسن ، وەکو لە موصحەفی مەغریبی یەکاندا ـ ئیستە چەند لەفظێ هەیە لەسەر لەهجەی غەیری قورەیشە بەم شێوە حەوت نوسخە لە موصحەفی شەریف نووسرایەوەو رەوانە کرا بە ئەطرافی عالەمدا ، بۆ مەککەو یەمەن‌و بەحرەین‌و کووفەو شام‌و میصرو یەکێ بۆ مەدینەی مونەووەرە کە پێی ئەڵێن : ئیمام .

جا پاش ئەوە کە ئەو حەوت نوسخە لە موصحەفی شەریف نووسرانەوەو رەوانە کران بۆ وڵاتانی ئیسلام ، حەزرەتی عوثمان ئەمری فەرموو بە خاوەن موصحەفەکان هەر کەسێ موصحەفی خۆی بشۆرێتەوە بە ئاو یاخود بیسووتێنێ بۆ ئەوە کە لە موستەقبەلدا نەبێ بە هۆی ئیختیلاف لە قورئانی کەریمدا ، حەتتا حەزرەتی عەلی (رضي الله عنه) موصحەفەکەی خۆی شۆردەوە . هەروەها حەزرەتی عائیشە (رضي الله عنها) و ئوبەییی کوڕی کەعب‌و سالمی مەولای حوذەیفەو عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ، هەرکام لەمانە موصحەفی خۆیان شۆردەوە ،

هەرچەند عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود لە ئەووەڵەوە کەمێ موخالەفەی کرد بەڵام لە ئەنجامدا ئەویش هاتە سەر بیری باقی ئەصحابەکان .

بەم کردەوە باشە ناجیحە عالەمی ئیسلامی لە ئاشووب و ئیختیلاف لە قورئاندا دەرچووو ئیجماع لەسەر ئەم وەزعە دامەزرا (والحمد لله على ذلك) .

ڕیوایەت کراوە لە عەمری کوڕی سەعیدەوە ئەڵێ :

حەزرەتی عەلی (كرّم الله وجهه) فەرمووی : لو كنت الوالي وقتَ عثمانَ لفعلتُ في المصاحفِ مثلَ الذى فعلَ عثمانُ ـ رضى الله تعالى عنهما وعن بقيّة اخوانهم أجمعين ـ .

مومەییزاتی ئەم جەمعە کە لە لایەنی عوثمانەوە کرا ئەوەیە : یەکەم تەرتیبی سوورەت و ئایەتەکان ، وەکو ئیستە کە لەناو ئێمەدا هەیە بوو بە ئەمرێکی ئیجماعی بۆ ئەصحابی پێغەمەر (ﷺ) .

دووەم (منسوخ التّلاوة) لە قورئاندا نەما بە قەطعی و هەرچی تەفسیر و تەعلیقات لەسەر موصحەفەکانیان نووسرابوو هەموو لەناوبران و بەس قورئانەکە مایەوە .

سێیەم ئەوەی کە ئەم لوجنە قەراریدا ئیجماعی لەسەر دامەزراو مەجالی شوبهەی کەس نەمایەوە .

چوارەم یەکجۆری قیرائەت بۆ قورئانی کەریم لە عالەمی موسوڵمانانداو دامەزرانی موسوڵمانان لەسەر ئەم حاڵە .

ئەم مومەییزانە بوون بە تەفسیری ئایەتی : (إنّا نحنُ نزّلنا ألذّكرَ وَإنّا لَه لحافِظونَ) .

# دەرزی سیازدەیەم لێکۆڵینەوەیەك

بەعزێ کەس ئەڵێن تەرتیبی سوورەت
بە ئیجتیهاد بوو نەك ئەمری حەزرەت

یەعنی ئەو لوجنە حەزرەتی عوثمان
ئامادەی کردن بۆ جەمعی قورئان

لەسەر ئیشرافی حەزرەتی عەلی
وایان تەرتیبدا بێ نەصصی جەلی

ئەگەر وەهاش بێ دانانی سوورەت
وا لەبۆ ئێمە بوو بە ضەروورەت

لە لایەکەوە ئەمری عوثمانە
کە عەینی حەیاو کەهفی ئیمانە

تەبەعیەتی خەلیفەی ڕاشید
ئەمری ڕەسوولە ڕەهبەری ماجید

(سنّتي وسنّة الخلفا)
ڕێگەی ئیسلامە ڕێی صیدق و صەفا

لە لایەکی تر بووە بە ئیجماع
ئیجماعی ئەصحاب بێ نوختەی نیزاع

(ولا تجتمع أمّتي على
ضلال) حەققە لای ئەهلی وەلا

هەرچەند بە قەولی ئەصحابی تەحقیق
تەرتیبی سوورەت تەوقیفەو تەوفیق

عەرضی ئاخری قورئان بۆ جوبریل
لە ڕەمەزاندا ساڵێ پێش ڕەحیل

دوو جار بۆ جوبریل هەمووی خوێندەوە
دەوری وەحیەکەی تازە کردەوە

هەروەها زەیدیش ساڵی پێش ڕەحیل
دوو جار خوێندیەوە بە شێوەی تەرتیل

لەبۆ حەزرەتی فەخری کائینات
برژێ بە سەریا نووری صەلاوات

ئەویش ئەو شێوە سوورەت و ئایەت
تەقریری فەرموو لەسەر عینایەت

وا ئەو تەرتیبە لەلای زەیدا بوو
بە یاسای تەقریر بە سوونەت دەرچوو

عوثمان و ئەصحاب بە یاسای سونەت
ئیتتیفاقیان کرد بە پاکی طینەت

مادام دامەزرا ئیجماع بێ خیلاف
لەسەر تەقریری (أشرف الأشراف)

قەت مەڵێ تەرتیب بە ئیجتیهاد بوو
بەڵکو پەیڕەوی مەولای عیباد بوو

حەزرەت بە شێوەی موصحەفەکەی زەید
دەوری کردەوە بە بێ شەرطو قەید

بۆیە صیددیق و عومەرو عوثمان
زەیدیان هێنا بۆ جەمعی قورئان

ئیتر ئیجماع بێ لەسەر ئیجتیهاد
یاخۆ سوننەتی سەییدی عیباد

مادام بە ئیجماع ئەمیش دامەزرا
موخالیف پەنجەی بە جەفا گەزرا

## تکاو رجایەك

دەخیل صەد دەخیل بە دڵ هوشیار بن
بۆ پاراستنی قورئان بێدار بن

ساختەچیەکان بە ساعات و ئان
مەشغوولن لە بۆ تەشویشی قورئان

لەبەر ئارەزووی هەواو نەفسی خۆی
ئەدا بە شانا چاکی کەوا بۆی

دێنێتە مەیدان ئەوضاعی پێشوو
پێش ئەوە حەزرەت موتەوەفا بوو

فلان موصحەفی وەها وەهای بوو
لەسەر تەرتیبی نزوول نووسرابوو

فلان کەسی تر موصحەفێکی وا
کە وێنەی نەبوو لە چەرخی دونیا

فلان کەس وەها ئایەی خوێندەوە
دینی ئیسلامی تازە کردەوە
لە مەدحی کۆنەو لە قەدحی تازە
بە وێنەی بولبول دەم بە ئاوازە

قەصدی ئەوەیە دڵت تێك بدا
بۆ ڕێگەی نارێك شانت لێ بدا

ئەو ساختەچیە ئیمان ناناسێ
ئارەزووی وایە سەرمان بماسێ

نازانێ هەرچی کیتابو سوننەت
تەقریری بکا ئەوەیە حوجەت

ئەگەر تەرتیبی لەسەر سوننەت بوو
مەعلوومە سوننەت ئەعلا حوججەت بوو

ئەگەر ئیجماع بوو ئەویش بە سوننەت
بووە بە حوججەت بۆ کاری ئوممەت

(ما آتاکم الرّسولُ) بگرن
لەگەڵ ئیجماعا هەتاکو ئەمرن

ئەر ئیجماع نەبوو هەر ئەکثەرییەت
ئەبێ بە سەبەب بۆ مەنصوورییەت

(لیسَ في الدّین أعلی حجّةٍ
بمثل : کنتم خیرَ أمّةٍ)

هەرگیز نەخڵەتێن بە درۆو بەتاڵ
لانەدەن لە ڕای ئەصحابی کەماڵ

ثابتە حەزرەت ئەمری ئەفەرموو
فلانە ئایەت لە کام سوورەت بوو

فلانە سوورەت لە فلانە جێ
لای فلان سوورەت ئەبێ دابنرێ

ئەم تەرتیباتە وەها مەلحووظە
هەمووی بە یاسای لەوحول مەحفووظە

که ئیجماعی عام دایەوە پرتەو
ئیتر بێ سوودە واتەی ئەم و ئەو

هەر موصحەفێ زوو هەرچۆن نووسراوە
لە کاتی جەمعا حاضر کراوە

ئەوان فەردێ بوون جەمع ئیجماعە
ئیجماع دەلیلی ڕێی ئیتتیباعە

مادام کە ئیجماع لای‌دا لە فەردی
ڕێگەی دینی گرت بە شێوەی وردی

بە ئەمری خوداو فەرموودەی ڕەهبەر
ئیجماع ڕێگەیە بۆ دینی بەشەر

(خير أمّةٍ أخرجت للنّاس)
بۆ کردەوەی ڕاس بکە بە میقیاس

ئیجماع دامەزرا ئەفراد نامێنێ
شەیتان وەسوەسە بۆ دڵ ئەنوێنێ

قەت مەکەونە دووی واتەی زەیدوعەمر
هەر بۆ خودایە حوکم و حەمدو ئەمر

ڕەسوول ڕەهبەرە یاسای حوججەتە
ئیطاعەی حەزرەت فەرزی ئوممەتە

(ابن مسعود) و (أبيّ) و عەلی
هەموو تابیع بوون بۆ خەیری جەلی

سوونەتی خولەفای راشیدین بە حەق
بکەن بە دەلیل بۆ حەقی موطڵەق

ئیجماع مەنصووصە ئەبێ بە دەلیل
شەخصی بێ دەلیل عەلیلەو ذەلیل

ئیطاعەی خوداو رەهبەرو ئەمیر
بە حەق دەستوورە بۆ دینی بەشیر

رەهبەریش یاسای خولەفای دانا
ئێجماعی دانا لە موسوڵمانا

شاهیدی حەقە بۆ خودا خواهی
جوملەی (حَسبُنا كتاب الله)

قەت نابێ ئێوە لە سوننەت لادەن
با گومڕاهەکان هەر ملیان بادەن

ئەر راست ئەوێ زەید ئیبنو ثابیت
زانا بوو بە حەق بە یاسای سوننەت

بەڵام کەوتە دووی فەرمانی صیددیق
بۆ جەمعی ئایات بە شێوەی تەحقیق

مەبەستی وابوو تا بە شەهادەت
قورئان دەرکەوێ ئایەت بە ئایەت

نەك یەکێ بڵێ ئایەتێکی وا
یاخود سوورەتێ لە قورئان نەما

بەس وەکو وتمان تا لەلای عالەم
دەرکەوێ فەضلی ئەصحابی خاتەم

خودا بۆ خاطر ئیخلاصی ئەوان
پەنامان بدا لە شەڕی تاوان

ڕسوامان نەکەی لە دونیاو دینا
خاسیرمان نەکەی لە دین و ژینا

تا بە سەربەرزی حەشرمان بکرێ
دەسمان داوێنی پێغەمەر بگرێ

دروودی خودا بە توولی زەمان
برژێ بە سەرتا (یاکهف الأمان)

کەهفی کەرەمت کافیە بۆمان
بۆ حیفظی پەیمان بۆ حیفظی ئیمان

باوەڕم وایە کە تکاکاری
تکا پەسەندی پەروەردگاری

پوختەی ئەم هۆنراوانە ئەمەیە :

ئەو جەمعی قورئانە کە لە لایەنی خەلیفەی سێیەمەوە عوثمان (رضی الله عنه) جێبەجێ بوو ، کارێکی زۆر بە سوود بوو و لەسەر راوێژکردن بوو بە زانایانی موهاجیرین و ئەنصارو ، ئەو لوجنە کە دانرابوون بۆ ئەم کارە موهیممە ، زاناو تەواناو ئەمین و بە تایبەتی کە موشریف لەسەر ئەوان حەزرەتی عەلی (رضی الله عنه) بوو . لەم جەمعەدا قورئان بە سافی لە ئایاتی (منسوخ التلاوه) لەسەر لەهجەی قورەیش نووسرایەوە ، ئەگەر لەفظێ لەهجەیەکی وای تێدا بووبێ کە لەگەڵ ئەم لەهجەدا رێك نەکەوتبێ لە موصحەفێکی عەلاحیدەدا نووسراوەو تێکەڵی لەهجەی قورەیش نەکراوەو تەرتیبی ئایات و جێگەیان لە سوورەتەکاندا بە دیاری کردنی پێغەمەر (ﷺ) بووە .

ئەمما بۆ تەرتیبی سوورەتەکان بەعزێ ئەڵێن : هەر لە زەمانی حەزرەتدا بووەو موصحەفی زەید بەو تەرتیبە نووسراوەتەوەو تەقریر کراوە لە لایەنی حەزرەتەوە (ﷺ) . خۆ ئەگەر بە فیکری عوثمان و باقی ئەصحابەکانیش بووبێ ئەوە ئیجماعی لەسەر کراوە .

## دەرزی چواردەیەم قیرائاتی سەبعە

حەزرەت فەرموویە : کاتێ جوبرەئیل
ئەهات بە یەك جۆر ئەی هێنا تەنزیل

منیش بۆ سەهلی لای موسوڵمانان
داوای زیادەم کرد بۆ لەهجەی قورئان

کاتێ هاتەوە بە ئەمری خودا
بە حەوت لەهجەی ساغ بەشارەتی دا

نەك بۆ هەموو لەفظ بەڵكو بەعزێ جێ
کە ئیختیلافی تێدا بێتەجێ

ئەو حەوت لەهجانە وەهان بۆ مانا
صافن لە غوبار بە وێنەی مینا

تەئثیریان نی یە بۆ مەعنای قورئان
بە نەوعێکی وا بگۆڕێ میزان

بۆ حەللی مەعنای ئەم قیرائاتە
ئەفکار گەلێکن لەم سەر بساتە

فیکرێ مەشهوورە لە دینەوەری
(ابن قتیبە) ی پایە سەروەری

رایەکیش لە لای (ابن الجزری)
فیکرێ لای ڕازی بە موختەصەری

جا بیری ڕازی چون بە تەمکینە
لێرە نووسینی گەلێ شیرینە

وجووهی سەبعە باش بەیان ئەکا
حەق بۆ حەقپەرست باش عەیان ئەکا

یەکەم فرووقی ئەسما بە تەخصیص
بە تەثنیەو جەمع تەذکیرو تەئنیث

دووەم ئیختیلاف بۆ صیفەی (أفعال)
ماضی و موضاریع ئەمری (ذی الجلال)

سێیەم ئیختیلاف لە وەزعی ئیعراب
چوارەم زیادەو نەقصە بە حیساب

پینجەم ئیختیلاف تەقدیم و تەئخیر
شەشەم بە شێوەی ئیبدال و تەغییر

حەوتەم ئیختیلاف لە لەهجەی تەعبیر
وێنەی صەنعەتی ئیمالەی یەسیر

تەفخیم و تەرقیق ئیظهارو ئیدغام
میثالیان زۆرە لە نەصصی کەلام

ئەو قیرائاتەیش چۆن وەرگیراون
لەسەر شێوەی زوو تا ئیستە ماون



# دەرزی چواردەیەم بە پەخشان

ڕیوایەت کراوە ڕۆژێ حەزرەت (ﷺ) لە مەدینەی مونەووەرەوە تەشریفی ڕۆیشت بۆ ناو قەبیلەی بەنی غیفار ، لەوێ لەسەر گۆلاوی بەنی غیفار وەحیی هاتە سەری و لەو مولاقاتەدا فەرمووی بە جوبرەئیل : من رەوانە کراوم بۆ سەر عالەم و فیعلەن وام لە ناو قەومێکی ئۆمیی نەخوێندەواردا و لە ناو ئەواندا ئینسانی دوور لە مەعریفەت زۆرە و لەهجەیان لە یەك دوورە و زەحمەتە هەموو بە یەك لەهجە قورئان بخوێننەوە ، تکام لە خودا وایە کە ڕێگەی ئاسانیان بۆ بکاتەوە ، جوبرەئیل غائیب بوو .

بۆ کاتی دوایی کە گەیشتەوە بە خزمەتی حەزرەت (ﷺ) عەرزی کرد : خودا ئەفەرموێت : ئەمر بکات بە قەومەکەی کە بە لەهجەیەك تا حەوت لەهجە قورئان بخوێننەوە و مانیع نی یە . راوی ئەم حەدیثە ئەبو داوودی فەقیی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری یە (رحمة الله علیهما) .

لە تەفسیری ئەم حەوت لەهجە یا حەوت قیرائاتەدا زاناکانی دین گەلێ قسەیان کردووە ، لەناو ئەواندا چوار کەسیان واتەیان موناسبە کە بریتین لە : ئیبنو قوتەیبەی دینەوەری و ئیبنولجەزەری و قاضی ئەبوطەییب و ئیمامی رازی . لەناو ئەم چوارەیشدا بیروڕای ئیمامی رازی زۆر پەسەندە ، بەڵکو وتوویانە : فیکری ڕازی لە واقیعدا هەر فیکری رەفیقە پێشووەکانیەتی ، بەڵام ئەم پوختەی کردوون و ناوی خۆی بە سەردا داوە . بە هەر حاڵ بیری ئیمامی ڕازی جوانە و بریتی یە لەمەی کە بەیانی ئەکەین ، حەوت قیرائەتیش عیبارەتە لەوە کە لە خوارەوە نووسراوە :

یەکەم : ئیختیلافی ئەسما بە ئیفرادو تەثنیەو جەمع و تەذکیرو تەئنیث ، وەکو ئەوە لە بەعزێ قیرائەتدا ئەخوێنرێتەوە : (والذينَ هُمْ لأماناتهم وَعَهدِهِم راعُونَ) لەسەر جەمعیەتی (أماناتِ) و لە بەعزێ

قیرائەتدا بە ئیفراد ئەفەرموێت : (وَالذينَ هُمْ لأمانتِهِم) کە موفرەدە .

دووەم : ئیختیلاف لە تەصریفی ئەفعالدا بە ماضیو موضاریعو ئەمر ، وەکو ئایەتی : (رَبّنا باعِدْ بَينَ أسفارنا) بەم شێوە کە (رَبّنا) مونادای موضاف بێتو (باعِد) صیغەی ئەمر بێت لە بابی (مفاعَله) . لە بەعزێ قیرائەتیشدا (ربُّنا بَعَّدَ بينَ أسفارنا) لەسەر ئەوە کە (ربُّنا) موبتەدا بێتو (بَعَّدَ) بە تەشدیدی عەین لەسەر وەزنی (فَرَّحَ) فیعلی ماضی لە بابی (تفعیل) بێت .

سێیەم : ئیختیلاف لە ئیعرابدا وەکو : (ذو العرش المجید) کە لەفظی (المجیدُ) مەرفووع بێتو خەبەربێت بۆ (هو) یاخود مەجروور بێتو صیفەتی (العرش) بێت .

چوارەم : ئیختیلافە بە نوقصانو زیادە وەکو : (وَما خلقَ الذّكرَ والأنثی) لەگەڵ (والذکر والأنثی) کە هەریەکی لەسەر قیرائەتێکە .

پێنجەم : ئیختیلافە بە تەقدیمو تەئخیر ، وەکو : (وَجاءَتْ سَكرةُ المَوتِ بالحَقّ) لەگەڵ قیرائەتی (وَجاءَتْ سَكرةُ الحقّ بالَموتِ) .

شەشەم : ئیختیلافە بە ئیبدالو گۆڕینەوەی حەرفێ بە حەرفێ ، وەکو : (نَنشزُها) بە زێی نوختەدار لەگەڵ (ننشرُها) بە ڕێی بێنوختە .

حەوتەم : ئیختیلافە بە لەهجە ، واتە : یەکێ لەفظێ ئەخوێنێتەوە لەسەر عادەتو یەکێکی تر ئەیخوێنێتەوە بە ئیمالە وەکو : (وَهَل أتاكَ) بە ئیثباتی ئەلفی (أتا) لەسەر عادەت ، یاخود لەسەر ئیمالەو لارکردنەوەی بۆ شێوەی (ێ) ی کراوە بە دوو نوختە . مەغزی مەعنای ئایەتەکان لە هەموو وجووهی قیرائەتەکاندا هەر ئەمێنێتەوە .



## دەرزی پازدەیەم قوڕای سەبعە

قوڕای خاوەن دین سەبعەی مەشهوورین
داباریٚ بۆیان هەزار ئافەرین

نافیع و حەمزە کیسائی و عاصیم
پێنجەم ئەبووعەمر عادڵ و عالیم

ئیبنو کەثیرو ئیبنو عامیرە
لە قیرائەتدا گەلیٚ فاخیرە
هەموو هەیانە یەکی دوو ڕاوی
بۆ ضەبطی لەهجە باش بە تەواوی

ڕاوی لە عاصیم شوعبەی ئەسەدی
دووەمیان حەفصە ڕاوی موقتەدی

لەسەر لەهجەی حەفص ئوممەتی ئیسلام
قورئان ئەخوێنن خەواص و عەوام

عاصیم لە حەبیب دڵپاکی وەلی
لە زەیدو ئوبەی عوثمان و عەلی

ئەوانیش هەموو لە ذاتی ڕەهبەر
حەزرەتی ڕەسوول شافیعی مەحشەر

درووودی خودا بە ئیحسان و جوود
بێتەسەر خاوەن مەقامی مەحموود

لە دینی ئیسلامی پیرۆزدا لە خصووصی خوێندنی قورئانو تەعلیمیەوە بە خەڵك ئیعتیماد لەسەر وەرگرتنی ئەو قورئانەیە لە ماموستایەکی عادلو عالم ، وە ئەو ماموستایشە لە ماموستایەکی تری عادڵو عالم تا ئەگات بە حەزرەت (ﷺ)

بەردەوام لەم ئوممەتی پێغەمبەرەدا (ﷺ) گەلێ زانای پێشەوای باوەڕپێکراو بوون ، کە وەکو بە ئیسناد لە لایەنی حەزرەتەوە (ﷺ) قورئانیان پێگەیشتووە وەها ئەو قورئانەیان تەعلیمی موسوڵمانان کردووە ، هەروا چین بە چین تا ئیمرۆو هەتا هەتایە (إن شاء الله تعالى) .

مەشهوورەکانی ئەصحابی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ تەعلیمی قورئان ئەمانەن : عوثمانی کوڕی عەففان ، عەلی کوڕی ئەبی طالیب ، زەیدی کوڕی ثابیت ، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ، ئەبو دەرداء ، ئەبو مووسای ئەشعەرین . ئەمانە هەموو قورئانیان لە ذاتی حەزرەت (ﷺ) وەرگرتووەو تەعلیمی موسوڵمانیان کردووە .

هەروا ئەو کەسانەیش کە عوثمانی کوڕی عەففان (رضی الله عنه) موصحەفەکانی پێدا ناردن بۆ شارەکانی ئیسلامو ، مەشهوورەکانی چینی تابیعین (رضی الله عنهم) کە ئەمانەن : سەعیدی کوڕی موسەییبو عورووەو سالمو عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو سولەیمانی کوڕی یەسارو عەطائی کوڕی یەسارو زەیدی کوڕی ئەسلەمو موسلیمی کوڕی جوندوبو ئیبنو شەهابی زوهریو عەبدولرەحمانی کوڕی هورموزو موعاذی کوڕی ئەلحاریث .

هەموو ئەمانە لە مەدینەی مونەووەرە بوون .

.. عەطاءو موجاهیدو طاووسو عەکریمەو ئیبنو ئەبی مەلیکەو عوبەیدی کوڕی عومەیریش لەگەڵ کۆمەڵێتردا لە مەککەی موکەڕەمە بوون .

عامیری کوڕی عەبدولقەیسو ئەبولعالیەو ئەبو رەجاءو نەصری کوڕی عاصیمو یەحیای کوڕی یەعمورو جەبیاری کوڕی زەیدو حەسەنی

بەصری و موحەممەدی کوڕی سیرین و قەتادەیش لەگەڵ کۆمەڵێکی تر ، ئەمانەیش لە بەصرە بوون .

عەلقەمەو ئەسوەدو مەسرووق و عوبەیدەو ڕەبیعی کوڕی خەیثەم و خاریثی کوڕی قەیس و عومەری کوڕی شەرەحبیل و عەمری کوڕی مەیموون و ئەبو عەبدولرەحمانی سەلەمی و عوبەیدی کوڕی فەضلەو ئەبو زەرعەی کوڕی عەمرو سەعیدی کوڕی جوبەیرو نەخەعی و شەعبی ، هەموو ئەمانەیش لە شاری کووفە بوون .

موغیرەی کوڕی ئەبی شەهابی مەخزوومی صاحێبی موصحەفی حەزرەتی عوثمانی کوڕی عەففان و ، خولەیدی کوڕی سەعید صاحیبی ئەبو دەرداءو کۆمەڵێکی تر . ئەمانەیش لە شام بوون .

لەپاش ئەمانە لە هەموو لایەکەوە خوێندەوارو قورئانخوێن گەلێ زۆر بوون و قیرائات بڵاو بووەوە لە هەموو وڵاتێکدا . بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا بە خواستی خودا بۆ پاراستنی قورئانی پیرۆز گەلێ لە زانایانی عالەمی ئیسلام خۆیان ئامادەکرد بۆ ضەبطی قیرائات و لەهجەکان لە تەلەففوظکردن و ئەدای قورئان بە مەضبووطی ، وەك :

لە شاری مەدینەی مونەووەرە (زادت شرفاً) ئەبو جەعفەر یەزیدی کوڕی قەعقاع و شەیبەی کوڕی یەضاح و نافیعی کوڕی ئەبی نەعیم .

لە شاری مەککەی موکەڕەمە (زادت شرفا) عەبدوڵڵای کوڕی کەثیرو حەمیدی کوڕی قەیسی ئەعرەج و موحەممەدی کوڕی موحەیصین .

لە شاری کووفە یەحیای کوڕی وەثاب و عاصیمی کوڕی ئەبی نوجوودو سولەیمانی ئەعمەش و حەمزە .

لە شاری بەصرە عەبدوڵڵای کوڕی ئیسحاق و عیسای کوڕی عەمرو ئەبو عەمری کوڕی عەلاو عاصیمی جەحدەری و یەعقووبی حەضرەمی .

لە شاری شام عەبدوڵڵای کوڕی عامیرو عەطیەی کوڕی قەیس و

ئیسماعیلی کوڕی عەبدوڵڵای ئیبنوموهاجیرو یەحیای کوڕی حاریثی ذەماري و شورەیحی کوڕی یەزیدی حەضرەمی .

بە جوهدو تێکۆشینی ئەمانە کۆمەڵێ لە قورڕاء پەیدا بوون وەکو ئەستێرەی ئاسمان ئەدرەوشانەوە .

لەناو ئەم زانایانەدا چاودێری وجووهی سەبعە ئەکرا کە حەزرەت (ﷺ) یەکە یەکە بە ئەصحابەکانی گەیاندبوو ، بەڵام لەو ڕۆژەدا بە ناوی قیرائاتی سەبعە مەشهوور نەبوون و لەپاش چەرخی ئەوان ئەو ناوە مەشهوور بوو لە عالەمی ئیسلامداو لە سەری سالی دووصەدی هیجری یەوە ناوی قیرائاتی سەبعە مەشهوور بوو لە ئیسلامدا . ئەو حەوت کەسە عیبارەتن لەمانە :

نافیع ، عاصیم ، حەمزە ، عەبدوڵڵای کوڕی عامیر ، عەبدوڵڵای کوڕی کەثیر ، ئەبو عەمری ئیبنوعەلا ، عەلی کیسائی .

لە سەری سالی دوو صەدی هیجری یەوە کە ئەو ناوە بلاو بووەوە قیرائەتی ئەبو عەمرو یەعقووب لە بەصرەو قیرائەتی حەمزەو عاصیم لە کووفەو قیرائەتی ئیبنو عامیر لە شاری شام و قیرائەتی ئیبنو کەثیر لە شاری مەککەو قیرائەتی نافیع لە شاری مەدینەی مونەووەرە مەشهوور بوون .

لە سەری سێ صەدی هیجریدا ئیبنو موجاهید ئەحمەدی کوڕی موسای کوڕی عەبباس کتێبێکی بەنرخی لە قیرائەتی سەبعەدا تەئلیف کردو قیرائاتی سەبعە بە تەفصیل کەوتە ناو قورڕای قورئانی کەریمەوەو لەناو کتێبی خۆیاندا نووسی یان ، بەڵام لەم تەئلیفەدا هەر ناوی کیسائی نووسی ئیتر ناوی یەعقووبی ڕەفیقی نەنووسی .

ئەمەیش کە ئیبنو موجاهید ناوی ئەو حەوتەی نووسیوە مەعنای ئەوە نی یە کە قیرائاتی صەحیحەی قورئانی کەریم حەصر بووە لەوانەدا ، بەڵکو هەر کەسێ کە قیرائەتەکەی جامیعی شرووطی موقەرەرە بێ ئەوە ئەو کەسە بە قاریئی موعتەبەر ناو ئەبرێت و قیرائەتەکەی جێگەی ئیعیتمادو باوەرە لە عالەمی ئیسلام و موسوڵمانانادا .

زیاد لەو حەوت قیرائەتە سێ قیرائەتی مەشهوور بوون کە بریتین لە قیرائەتی جەعفەرو خەلەف و یەعقووب . لەگەڵ حەوتەکەدا بوون بە دە قیرائەت ، وەکو زیاد لەمانەیش چوار قیرائەتی تر هەن کە بریتین لە قیرائاتی : حەسەنی بەصری و ئیبنو موحەیصین و یەحیای یەزیدی و شەنبووذی ، جەمعەن بوون بە چواردە قیرائەت .

لە واقیعدا ئەم قیرائەتانە کە وان لە ژووری حەوت قیرائەتەکەوە خۆیان سەربەخۆ نین بەڵکو لە تەرکیب لە حەوت قیرائەتەکەن و لە زیادو کەمی ئەوان پەیدا بوون .

قیرائاتی سەبعە موتەواتەرن ، هەرکام لەوانە جوبرەئیل (علیه السلام) گە یاندوویە بە حەزرەت (ﷺ) و ئەویش گەیاندوویەتی بە کۆمەڵێ لە ئەصحابەکانی بە شێوەیەك کۆمەڵەی وەها رێك نەکەون لەسەر درۆکردن ، هەروا چین بە چین هاتووەتە خوارەوە بە تەواتور . باوەڕ بەوانە واجبی ئینسانی موسوڵمانە .

(وفّقنا الله تعالى على الاعتقاد الجازم بها آمين)

# بەیانی وەلادەت و وەفاتی قوڕای سەبعە

یەکەم : ئیبنو عامر ناوی عەبدوڵڵایەو نیسبەت ئەدرێ لە یەحصوب کە بەشێکە لە وڵاتی یەمەن ، ئەم ذاتە لە تابیعینەو قیرائەتی وەرگرتووە لە موغەیرەی کوری ئەبو شەهابی مەخزوومی ، ئەویش لە عوثمانی ذی‌النورین ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) و لە تەئریخی صەدو هەژدەی هیجریدا لە شاری شام موتەوەفا بووە . ئەم ذاتە دوو راویی هەیە یەکەم هیشام کە لە شام لە دوو صەدو چل و پێنجدا وەفاتی کردووە . دووەم ذەکوان ، کە لە دوو صەدو چل و دوودا وەفاتی کردووە .

دووەم : ئیبنو کەثیر کە ناوی عەبدوڵڵایەو مەشهوورە بە ئیبنو کەثیری داری ، لە تابیعینەو لە ئەصحابەکاندا گەیشتووە بە عەبدوڵڵای

کوڕی زوبەیرو ئەبو ئەیووبی ئەنصاری و ئەنەسی کوڕی مالیك ـ خودایان لێ ڕازی بێ‌و ، لە تاریخی صەدو بیستدا لە مەککەی موکەڕەمە موتەوەفا بووە . ئەم ذاتەیش دوو ڕاویی هەیە : بەززی و قونبول .
سێیەم : عاصیم کە کونیەی ئەبو بەکرەو کوڕی ئەبو نەجوودی ئەسەدی‌یە . ئەم ذاتە لە خزمەتی زیری کوڕی حوبەیش‌دا کە ئەویش لە لای عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ئەویش لە حەزرەت (ﷺ) قورئانی وەرگرتووە و ، لە ساڵی صەدو بیست‌و حەوتدا لە کووفە یا لە سەماوە موتەوەفا بووە . ئەم ذاتەیش دوو ڕاویی هەیە : یەکەم شوعبە ، دووەم حەفص ، شوعبە مەشهوورە بە ئیبنو عەییاش‌و لە ساڵی صەدو نەوەدو سێدا لە کووفە موتەوەفا بووە ، دووەم ئەبو عەمر ، (حفص بن سليمان بن المغيره) . ئەم ذاتە ڕەبیبی عاصیم بووەو لە خزمەتی ئەودا تەربیەتی وەرگرتووەو لە ساڵی صەدو هەشتادا موتەوەفا بووە .
چوارەم : ئەبو عەمر ڕەییان کوڕی عەلای کوڕی عەمماری بەصری ، ریوایەتی کردووە لە حەسەنی بەصری‌و حەسەن لە حەططان‌و لە ئەبو عالیە . ئەم ذاتە لە ساڵی صەدو پەنجاو چواری هیجریدا موتەوەفا بووە ، ئەم ذاتە دوو ڕاوی هەیە ، یەکێکیان : دوری‌و ، ئەویان : سووسی‌یە .
پێنجەم : ئەبو عەممارە حەمزەی کوڕی حەبیبی کووفی . ئەم ذاتە لە حەلوان لە ساڵی صەدو پەنجاو شەشدا موتەوەفا بووەو دوو ڕاوی هەیە : خەلەف‌و خەللاد .

شەشەم : نافیعی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبو نەعیمی مەدەنی ، ڕەئیسی موقریئان بووە لە مەدینەی مونەووەرەو لە ساڵی صەدو شەصت‌و نۆدا موتەوەفا بووە . ئەم ذاتە دوو ڕاویی هەیە : قالوون‌و وەرش .
حەوتەم : کیسائی ئەبولحەسەن عەلی کوڕی حەمزەی کیسائیی نەحوی ، مەشهوور بووە بە کیسائی ؛ چونکی لە کاتی ئیحرامی حەجدا

بەرگ و پۆشاکی لەبەرکردووەو لە سالی صەدو هەشتاو نۆدا موتەوەفا بووە . ئەم ذاتە دوو راویي هەیە : ئەبوحاریث لەیثی کوڕی خالیدی مەروزی کە لە ئەصحابی کیسائی بووەو لە سالی دوو صەدو چلدا موتەوەفا بووە . دووری‌یش کە ئەبو عومەر حەفصی کوڕی عومەری دووری‌یە ، خودای تەعالا جەزایان بداتەوە بە لوطف و میهرەبانی خۆی و ئێمەیش لەبەر خاطری ئەوان ببەخشێ .

(الحمد لله) لە فەضلي مەننان
تەواو بوو باسی حەوت عالمەکان

ئەو قورای سەبعەی صاحێب دەرەجات
کە بوون بە میصباح لەبۆ کائینات

هیوام وەهایە باسی ئەمانە
قەلای پاریز بێ لە ڕووی زەمانە

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين والتابعين باحسان إلى يوم الدين .

## دەرزی شازدەیەم

ئەمجارە کاتی تەجویدەو تەرتیل
تەجوید واجبە بۆ ئەدای تەنزیل

تەجوید بە لوغەت ئەی برای دڵپاك
کردنی کارە بە وەزعێکی چاك

له ئیصطیلاحی قورڕای قورئانا
تەجوید ئەوەیە لەگەڵ ئیمکانا :

حەقی هەر حەرفێ بێ زیادو نوقصان
جێ بەجێ بکەی بۆ فەوزی ئیحسان

حەرەکەو سکوون ، وەصڵ و وەقف و مەد
ئیخفاو ئیظهارو قەلب و دەغم و شەد

تەفخیم و تەرقیق باش ئاگات لێ بێ
جێ بەجێی بکەی بۆ هەر حەرفی بێ

مەوضووعی تەجوید لەفظی قورئانە
(من حیث الأداء) وا بیستوومانە

غایە تەحسینە لەبۆ تیلاوەت
بۆ نەیلی جەزا بۆ فەوزی ڕەحمەت

حوکمی وجووبە فەرزە لەسەرمان
فەرزی کیفایەی عامەی موسوڵمان

بۆ خوێندنەوە لە فەرزی عەینە
تێی ئەگا ئەوەی کە خاوەن زەینە

یانی فاتیحە کە فەرزی بەینە
تەجویدی بەحەق لە فەرزی عەینە

باقی تیلاوەی ماباقی قورئان
تەجویدی فەرزە پێویستی ئینسان



# مەخاریجی حرووف



حرووفی عیلە ئەلف و واوو یێ
لە هەر کەلیمەو شوێنێکا هەبێ

مادام ساکن بن مەددن ئەودەمە
یێ لەپاش کەسرە واو لەپاش ضەمە

ئەلف بەدەوام لە حەرفی مەددە
هەم حەرفی لینەو عیللەی بێرەددە

بەڵام واوو یێ جاربەجار مەددن
جاربەجار لینی بێمەنع و سەددن

بۆ ئەم حەرفانە لەکاتی ئەدا
مەخرەج ناوەدەمە لەگەڵ هەوادا

بەڵام بۆ واوێ کە غەیری مەددە
بەینی دوو لێوت جێگەو سەرحەددە

## حرووفی حەلق

حرووفی گەروو شەشن هەمزەو هێ
ناوەڕاستەکەی لەبۆ عەین و حێ

ئاخری گەروو مەخرەجە بۆ غەین
لەژوور غەینەوە خێ ئەی نووری عەین

## قاف و کاف

قاف جێی لوهاتە بنی زمانە
کاف وا لەملاوە بەرەو لێوانە

ڕێکی مەخرەجیان لە مەڵاشووی دەم
پێویستە بۆیان یەقین خاطرجەم.

## جیم ، شین ، یێ

جیم و شین و یێ مەخرەجی هەموان
دائەگرێ بە حەق ناوقەدی زمان

لەگەڵ مەلاشووی بەرابەر بەوجێ
باش دەریان بخە ئاگات لە خۆ بێ

بۆ ضاد قەراخی زمانی ئینسان
لەگەڵ خرێدا لە ڕاستو چەپیان

گەلێ گرانە تەکەللوم بە ضاد
پێویستی مەشقە لای بەعزێ ئوستاد

ضاد حەرفی ساغە قەت نەیکەی بە ظێ
نوێژ بەتاڵ ئەکا ئاگات لە خۆ بێ

لام لە قەراخی زمانە جێگەی
لەگەڵ مەلاشوو ئەبێ تێبگەی

گەلێ گوشادە جێگەی حەرفی لام
بۆیە ئاسانە لە ڕیزی کەلام

وا لەژێر لاما جێگەی حەرفی نوون
لەگەڵ مەلاشوو بە بێ چەندو چوون

ڕێ لەژێر لاما بۆ پشتی زمان
ئەڕوانێ دائیم بە طوولی زەمان

حەرفی زەلاقەن لامو نوونو ڕێ
زمان بەمانە پاش دەرئەپەڕێ

دال و تێی بچووك لەگەڵ حەرفی طێ
بە سەری زمان هەموو دێنەجێ

هەم بێ دانی سەرووی پێشەوە
لەبۆ مەلاشوویش بەرزئەبێتەوە

تەفارتێکی زۆریشیان هەیە
مامۆستای زانا وێنەی بابەیە

صادو سین و زێ بە سەری زمان
هەم سەری دانی پێشووی خواروومان

حەرفێ ذال و ثێ لەگەڵ حەرفی ظێ
بەسەری دان و سەرزمان ئەبێ

بە ناوی لێوی خواروو و سەری دان
لەلای سەرەوە فێ بکە بەیان

واوی غەیری مەد لەگەڵ میم و بێ
بە هەردوو لێوی ئینسان دێنەجێ

بەلام لەبۆ واو باش ئەکرێنەوە
لەبۆ میم و بێ لێك ئەدرێنەوە

غونە دەنگێکە ناسك و مەربووت
دێتە دەرەوە لە برناخی لووت

# دەرزی شازدەیەم بە پەخشان

تەجوید لە زمانی عەرەبیدا ، مەعنای : کاری باشکردن ، لەعورفی قاریئەکانیشدا ئەوەیە : هەر حەرفێ حەقی خۆی پێ بدەی ، لە ئیظهارو ئیخفاو ئیدغام و قەلب و غوننەو غەیری ئەوانە لە صیفاتی حرووف .

مەوضووعی عیلمی تەجوید : ئەلفاظی قورئانی پیرۆزە لەبارەی تەلەففوظ پێ کردنیانەوە بەراستی موافیقی واقیع و شەرع .

غایەو فائیدەکەی : پاراستنی زمانە لە غەلەط کردن لە خوێندنەوەی قورئاندا و گەیشتنە بە شێوەی خوێندنەوەی حەزرەتی فەخری عالەم (ﷺ) وەها کە گەیاندوویەتی بە ئەصحابەکانی ، ئەوانیش گەیاندوویانە بە چینی دوایی .

حوکمی زانینی عیلمی تەجوید : فەرضییەت و وجووبە ، بەصوورەتی کیفایە ، بۆ پاراستنی قورئانی پیرۆز بە ساغی و راستی و بە صوورەتی فەرزی عەین بۆ ئینسان بۆخۆی لە واجیباتی دیندا ، وەکو : خوێندنەوەی سوورەتی فاتیحە لە نوێژداو ئەو سوورەتانەی کە لەگەڵ فاتیحەدا ئەخوێنرێن ، هەروا لە خوێندنی قورئاندا . ئینسان کە قورئانی خوێند فەرزی عەینە ئەو قورئانە بەتەجویدەوە بخوێنێتەوە ، ئەگەرنا گوناهبار ئەبێ .

# مەخاریجی حرووف

خودای تەعالا بە میهرەبانی خۆی بۆ ئەوە کە ئادەمی لە یەك تێبگەن و چاری پێویستی خۆیان بکەن ، وتەو ویژەی پێ داون ، کە لەناو ئەسبابی تەفاهومدا لە ئیشارەکردن و وێنەنووسی ئاسانترە .
هۆی ئاسانی یەکەشی ئەوەیە کە ئادەمی گیانلەبەرە ، خاوەن هەناسەیەو

هەمیشە هەوا لەدەرەوە وەرئەگرێ بۆ دەروونی و لەپاش چەند ثانیەیەك ئەو هەوایە گەرم ئەبێت و پێویستە بیکاتە دەرەوەو هەوایەکی تازەی فێنك وەربگرێت . ئەم هەوایە کە دەرو ژوور ئەکا لەلای ژووری گەرووەوە تا سەرلێوەکان ، لە هەر شوێنێ ببرێ دەنگێکی تایبەتی لێ پەیدائەبێ ، کە بە عەرەبی ناوی حەرفەو لە کوردیدا (پیت) ی پێ ئەڵێن .

بۆ زمانی ئادەمیزادی عەرەب بیست و هەشت حەرف هەیەو بیست و هەشت مەخرەجیان پێویستە ، وەکو باسیان ئەکەین . پێش باسی مەخرەجەکان ئەمە بزانە :

هەرکاتێ هەمزەی مەفتووحەت نایە سەر حەرفێ لەو بیست و هەشت حەرفەو لەسەری ڕاوەستای ، مەحەللی ئەو حەرفەت بۆ دەرئەکەوێ بۆ وێنە کە وتت : (أَمْ) ، ئەزانی مەخرەجی میم هەردوو لێوە . کاتێکیش وتت : (أَخْ) ، ئەزانی مەخرەجی خێ گەرووە هەروەها حەرفەکانی تریش ، جا ئەم مەخرەجانە وەربگرن .

١ ـ باسی مەخرەجی حرووفی عیللە ، کە ئەلف و واوو یێ یە ، ئەم حەرفانە مادام ساکن بن ، واتە : زەنەیان ببێت و حەرفی پێش واو مەضمووم و پێش یێ مەکسوور بێ ـ وەکو حەرفی پێش ئەلف دائیمە مەفتووحە ـ ئەوە لەمکاتەدا ، وەکو بە حەرفی عیللەو حەرفی لین ناوئەبرێن ، ناویش ئەبرێن بە حرفی مەدد .

خۆ ئەگەر ساکن بن و ماقەبلیان مەفتووح بێ ئەوە بە حەرفی عیللەو حەرفی لین ناوئەبرێن ؛ کەوابێ ئەلف بەدەوام حەرفی مەدو لینە ، بەڵام واوو یێ جارێ حەرفی مەدو جارێ حەرفی لین ئەبن . مەخرەجی حرووفی عیللە ، کاتێ کە حەرفی مەد بن ، ناوی دەمە لەگەڵ هەوای دەمدا ، بەڵام مەخرەجی واو کە حەرفی لین بێ ناوی لێوەکانە .

٢ ـ مەخرەجی حرووفی حەلق = گەروو ، کە شەشن : هەمزە ، هێ ،

عەین ، حێ ، غەین ، خێ : گەرووە . جا مەخرەجی هەمزە وا لەلای ژووری گەرووەوە . مەخرەجی هێ لەنزیکی ئەودایە بەلای دەمەوە . مەخرەجی عەین ناوەڕاستی گەرووە . هەروا مەخرەجی حێ لەپاڵ ئەودایە بەلای دەمەوە . مەخرەجی غەین لە کەوانەی گەروودایەو مەخرەجی خێش لەلای ئەودایە بەلای دەمەوە .

٣ ـ مەخرەجی قاف لە بنی زمانە لەگەڵ بەرابەری خۆی لە مەڵاشوو . مەخرەجی کاف لەلای ئەودایە بەلای دەمەوە . بە مەخرەجی قاف ئەڵێن (غلصمه) . بە مەخرەجی کاف ئەڵێن : (عكده) .

٤ ـ مەخرەجی جیمو شینو یێی زەنەداری ماقەبل مەفتووح ناوەڕاستی زمانە لەگەڵ هەوای ناودەمدا هەتا ئەگاتە مەڵاشوو .

٥ ـ مەخرەجی ضاد : قەراخی زمانە بەلای ڕاستدا یـا بەلای چـەپدا لەگەڵ خرێدا لەلای ڕاستەوە یـا لەلای چـەپەوە . دەرکـردنی ئەم حەرفە بەمشێوە زۆر گرانەو پێویستی بە پێ ڕاهاتنە .

٦ ـ مەخرەجی لام قەراخی زمانـە لە سـەرەوە بۆ خـوارو مەڵاشـووی سەروو بەرابەری بەشی خۆی لە زمان جێگەی دەرکردنی لامە . ئەمە زۆر گوشادە بۆیە تەلەففوظ پێ کردنی ئاسانە لەسەر زمان .

٧ ـ مەخرەجی نوون سەری زمانە لەگەڵ بەرانبەری خۆی لە مەڵاشووی سەروو لەژێر مەخرەجی لامدا .

٨ ـ مـەخرەجی ڕێ : سـەری زمانـە لـەگـەڵ بـەرانبـەری خـۆی لـە مەڵاشوو ، بەڵام بۆلای پشتی زمانەوە مەیل ئەکات .

٩ ـ مەخرەجی طێی گەورەو تێی بچووكو دال : سەری زمانە لەگـەڵ بێخی دانە پێشووەکانی لای سەرەوەو لەگەڵ مەلاشوودا .

١٠ ـ مەخرەجی صادو سینو زێ : سەری زمانە لەگـەڵ سەری دانـە پێشووەکاندا لەلای خوارەوە .

١١ ـ مەخرەجی ظێو ذالو ثێ : سـەری زمانـە لەگـەڵ سەری دانـە پێشووە ژووروەکاندا .

١٢ ـ مەخرەجی فێ سەری دانە پێشووە سەرووەکانە لەگەڵ ناوی لێوی خوارووودا .
١٣ ـ مەخرەجی واوی غەیری مەددو میم و بێ : هەردوو لێوە ، بەڵام بۆ واو ئەکرێنەوەو بۆ میم و بێ ئەنرێنەوە بەیەکدا .
١٤ ـ مەخرەجی غوننەی نوون بڕناخی لووتـە کە بـە زمانی عـەرەبی : (خیشوم) ە .

## دەرزی حەڤدەیەم لە صیفاتی حرووفدایە

حرووفی هیجاء وەکو مەشهوورە
دەیان مەهموسەن باقی مەهجوورە

بەعزێ شەدیدە بەعزێکیان نەرمن
بەعزێ بەینەبەین نزیك بە شەرمن

هەروا بەم جۆرە عولەمای تەجوید
باسیان کردوون بۆ ڕۆڵەی ڕەشید

(کَسَف شخصُه حثت) مەوصووفە
بە صیفەتی هەمس وەکو مەعرووفە

کاتی ئیخراجیان هەناسەی ئینسان
بێدەنگ دەرئەچێ بە یاسای ئاسان

باقی حەرفەکان مەهجوورن تەواو
هەناسە بەهێز دەرئەکەن لەناو .

(اکتب ، قط ، جد) خاوەن شیددەتن
حەرفی (لم نرع) موتەوەسسیطن

حرووفی (رخوە) ن باقی حەرفەکان
نەرمن دەرئەچن بێتاوو تەکان

(قظ ، خصّ ، ضغط) حەرفی ئیستیعلان
بەرەو مەلاشوو سەرئەخەن زمان

ئەلباقی هەموو حرووفی سوفلین
یەعنی بە ئەوصاف دژمنی عالین

لە موستەعلادا حرووفی ئیطباق
صادەو ضادەو ظا طا بەئیتتیفاق

زمان ئەلکێنن بە مەلاشوودا
بە بێموسافە لە هاتوچوودا

باقی مونفەتیح کاتێ کە دەرچوو
زمان ناچەسپێ لەسەر مەلاشوو

(فرّ من لُبٍّ) حەرفی ئینزیلاق
زمان ڕەوێنن لەسەر ئیتتیفاق

غەیری ئەو شەشە خاوەن ئیصماتن
لە تەلەففوظدا بێدەنگ و ماتن

(ذو الجناحین) ە رێ بە لەهجەی ساف
خاوەن تەکرارەو خاوەن ئینحیراف

بە وێنەی دوو رێ ئەکەوێتە رێ
بە پەلەکردن دەرئەچێ لە جێ

لام مونحەریفە شین تەفەششی دار
واتە : بە بۆشی خۆی ئەکا ئیظهار

بەعزی تەفەششی هەم دێنێتە یاد
بۆ ثێ هەم بۆ فێ هەم بۆ حەرفی صاد

حرووفی صەفیر زێیەو صادو سین
ئاوازەی درێژ دەرئەخەن بەتین

ضاد موستەطیلە درێژ ەدارە
نوطق بەم حەرفە بۆ جەوهەردارە

حەرفی قەلقەلە قافەو طێیەو بێ
لەگەڵ جیم و دال ئاگات لە خۆ بێ

بە (قطب جدّ) ضەبط کراوە
قوطب بەقەدرە لە هەموو لاوە

# دەرزی حەڤدەیەم بە پەخشان

صیفاتی ئەم حەرفانە کە ڕابووردن زۆرە یەکەم هەمسە ، کە مەعنای وایە : لە تەلەففوظ بەوحەرفانە هەناسەی ئینسان بە پەنامەکی دەرئەچێ . ئەمانە دە حەرفن : تێ ، ثێ ، حێ ، خێ ، سین ، شین ، صاد ، فێ ، کاف ، هێ . ئەمانە لە (کسفه شخص حثت) دا گردئەبنەوە . باقی حرووفی هیجاء هەموو مەجهوورەن و صیفەتەکەیان جەهرەو لەکاتی تەلەففوظکردن بەوانە هەناسەی ئینسان بەئاشکرا دەرئەچێ . دوەم صیفەت جەهرە لە موقابیلی هەمسەوە . سێیەم و چوارەم و پێنجەم لەو صیفەتانە شیددەت و ڕەخاوەت و تەوەسسوطە ، یەعنی ڕەقی و نەرمی و ناونجی .

دە حەرف لە حرووفی هیجاء شەدیدن ، یەعنی ڕەق و سەختن لە تەلەففوظ پێکردندا ، وەکو : هەمزە ، بێ ، تێ ، جیم ، دال ، طێ ، کاف ، قاف ، کە گردئەبنەوە لە لەفظی : (اکتب ، قط ، جد) دا .

موتەوەسسیطەکان (یانی ناونجی یەکانیان) ئەمانەن : لام ، نوون ، عەین ، میم ، ڕێ کە لەلەفظی (لِنْ عمرُ) دا گردئەبنەوە .

ماباقیِ حرووفی هیجاء هەموو ڕەخاوەتیان هەیە ، واتە : لە تەلەففوظدا نەرمن .

شەشەم و حەوتەم لەوصیفەتانە ئیستیعلاو ئیستیفالەیە . واتە حەرفی عولوی و سوفلی .

حرووفی ئیستیعلا ئەوانەن کە لەکاتی تەلەففوظکردن بەواندا زمان بەرزئەبێتەوە بۆ مەلاشوو ، ئەمانە بریتین لە صاد ، ضاد ، طێ ، ظێ ، غەین ، قاف ، خێ ، کە لەم سێ کەلیمەدا : (قظ ، خصّ ، ضغط) گردئەبنەوە .

ماباقی حرووفی هیجاء هەموو حرووفی ئیستیفالەن ، واتە لەکاتی تەلەففوظکردندا بەوحەرفانە زمانی ئینسان ناڕوات بۆ مەلاشوو ، بەڵکو

مەیلی خوارەوە ئەکا .

هەشتەم و نۆیەم لەم صیفەتانە ئیطباق و ئینفیتاحە ، حەرفی ئیطباق یا موطبیقە ئەوانەن لەکاتی تەلەففوظ پێ کردنیانا زمانی ئینسان چەسپ ئەبێ بە مەلاشوویەوە . حەرفی ئیستیفالە ئەوانەن کە لەکاتی تەلەففوظدا چەسپ نابن ، حرووفی ئیطباق عیبارەتن لە : صاد ، ضاد ، طێ ، ظێ . باقی حەرفەکانی تریش حرووفی ئینفیتاحن .

دەیەم و یازدەیەم ئینزیلاق و ئیصماتە . حرووفی ئینزیلاق یا زەلاقە ئەوانەن کە : زمان لەکاتی تەلەففوظ پێ کردنیاندا ئەجوولێ و ئەروا . ئەمانە شەش حەرفن بێ ، رێ ، فێ ، میم ، نوون ، لام . کە لە : (فرّ من لبّ) دا گردئەبنەوە . باقی حرووفی هیجاء هەموو موصمەتەن و لەکاتی تەلەففوظدا زمان لەسەر عادەت ئەجولێتەوە .

دوازدەیەم و سیازدەیەم تەکرارو تەفەرودە . حەرفی تەکرار تەنیا حەرفی رێی بێ نوختەیە ، کاتێ تەلەففوظێ پێ ئەکرێ . وەکو دوو حەرف وایە . باقی حرووف فەردن و ثابیتن .

چواردەیەم : صیفەتی تەفەششی یە ، واتە : بۆشی لە دەنگدا . ئەم صیفەتە بۆ ثێی سێ نوختەو بۆ شین بە سێ نوختەو بۆ فێ و ضادی نوختەدار .

پازدەیەم : صیفەتی صەفیرە . کە صیفەتە بۆ صادو سینی بێ بێ نوختەو بۆ زێی نوختەدار .

شازدەیەم : ئیستیطالەیە کە صیفەتە بۆ ضادی نوختەدار .

حەڤدەیەم صیفەتی قەلقەلەیە ، کە صیفەتە بۆ جیم و دال و قاف و طێ و بێ ، کە لە (قطب جدّ) دا گردئەبنەوە .



# دەرزی هەژدەیەم
# ڕاگرتنی صیفاتی حرووف

صیفاتی حرووف ڕابگرە تەواو
نەکا بێنەدەر نیوەو ناتەواو

ئەلف کەوتە پاش حرووفی سوفلی
حەقیان نەرمی یەو تەرقیقی جەلی

هەمزە موطڵەقەن تەرقیقی ئەکرێ
تایبەتی کاتێ لەم چوار جێدا بێ

لەگەڵ عەین و حێ لەگەڵ حەرفی ها
یا لەسەر ئیسمی پیرۆزی (الله)

ڕابگرە هەمزەی خاوەن حەرەکە
لەپاش واوو یێ خاوەن بەرەکە

یا هەمزەی ساکن لەپاش موحەرەك
چاودێری بۆ تۆ باشەو موبارەك

بێ بخوێنەوە بە جەهرو شیددەت
لە هەر شوێنێ بێ بە عەزم و هیممەت

بێی (برقُ ، باطل ، بِهِم ، بِهِا ،
بِذي ) ڕەقیقە لەلای عَولەما

بەڵام بێ لەناو (ارکبْ معنا)
دەغمە لە میمدا ئەی خاوەن مەعنا

وەصفی حەرفی تێ باش بەجێ بێنە
شیددەت و هەمسی تەواو بنوێنە

گرانە ئەدای تێ لەگەڵ تێدا
لەگەڵ سین و شین هەم لەگەڵ ڕێدا

لەگەڵ صادو ضاد لەگەڵ حەرفی طێ
هەروا لەگەڵ ظێ ئاگات لە خۆ بێ

تێی زەنەداری تەئنیث دەغم ئەبێ
لە دال و تێدا هەم لە حەرفی طێ

ئیظهاری ئەکرێ لەپێش جیم و ثێ
لەپێش سین و زێ لەگەڵ صادو ظێ

ئەمەی کە نووسیم قیرائەی حەفصە
لادان لە دەرزی پێشەوا نەقصە

ثێ لە (لَبِثْتُم) ئیظهار ئەکرێ
هەروا (اُورِثتم) با جێگە بگرێ

هەرکەس بە ڕێگەی حەفصا سالیکە
بە ئیدغام ئەڵێ : (یَلهثْ ذلكَ)

ئیظهاری حەقە جیمی زەنەدار
لەگەڵ ئەم هەشتا ئەی برای هوشیار

تێ دال و ذال و ڕێ زێ سین و لام
هی ئاخریانە ئەی برای ئارام

حێ بەیان بکە بە بەیانی صاف
لەگەڵ صادو طێ لەگەڵ حەرفی قاف

(حِطّة) و (حَصْحَص ، حقّ) بو میثال
بکە بە سەرمەشق بۆ گەورەو منداڵ

خێ لە کاتێکدا ئەیخوێنێتەوە
شیددەی پێویستە لێی نەبێتەوە

دال حەرفی جەهرەو قەلقەلەو شیددەت
چاودێری ئەوێ برای بەعیززەت

کە گەیشتە دال یا گەیی بە تێ
بە یاسای تەجوید دەغمی دێتەجێ

لەپێش حرووفی (بل نفخر) هەموو
ئیظهاری فەرزە لانەدەی بە موو.

پێش ئەم حەرفانەیش ئیظهاری فەرزە
لای حەفصی ڕاوی ئەو ذاتە بەرزە

جیم و ذال و زێ سین و شین وصاد
لەگەڵ ضادو ظێ وەربگرە ئیرشاد

دەغمی ذال ئەکرێ لە ذال و ظێ دا
بە ئیتتیفاقی قوڕاء لەم جێدا

ئیظهاری ئەکا حەفص بۆ ئیرشاد
پێش تێو جیم و دال ، ڕێ ، زێ سین و صاد

ڕێ کاتێ گیرا واتە : موشەددەد
ئیخفای تەکراری مەطلووبەو مەقصەد

کە کەوتە پێش نوون یا لەپێشی لام
ئیظهاری فەرزە لای حەفصی ئیمام

یەکەم (وَقَرنَ في بُيوتِكُنَّ)
دووەم بە وێنەی (واستَغفر لَهُنَّ)

ڕێ کە مەکسوور بێ فەرزە لەسەرمان
تەرقیقی بکەین بەگوێرەی ئیمکان

موتەحەڕیك بێ مابەعدی یا نە
پێش ئیستیعلا بێ یا دوورەلانە

کەسرەی ئەصڵی بێ یا عاریضی خاص
یا بۆ ئیمالەو رەوم و ئیختیلاس

کەسرەی ئیمالە لای حەفصی ئیمام
بەس لە (مجْریها) دێتە ناو کەلام

هەروا رێی ساکن تەرقیقی ئەکرێ
کاتێ پاش کەسرە جێگەی خۆی بگرێ

کەسرەی لازمی ئەصڵی موتتەصیل
وەکو (مِرْیَةٍ) بە قەولی فاصیل

یاخود سکوونێ بووبێ بە فاصیل
وێنەی (ذِکْرو سِحْر) بە وەقفی حاصیل

بە بێ ئیتتیصال بە ئیستیعلای خاص
بە وێنەی (مرصاد) یا وێنەی (قرطاس)

یا بەیێی ساکن یا ئەلفێکی وا
ئیمالەی بکرێ بۆ سوکی صەدا

میثالی یەکەم بە وێنەی (خَبیر)
دووەم (فی الغار) ئەی برای بەصیر

ئیتر هەر تەفخیم فەرزە لەبۆ رێ
مادا بە غەیری ئەم حاڵانە بێ

دەی تەفخیم فەرزە بۆ رێی (ارجعوا)
(الذي ارتضى) هەم (أم ارتابوا)

هەروا (مرصاد) و (قرطاس) و (فرقە)
تەفخیم لەبۆ رێ لەمانە حەققە

رێی (كلّ فرق) لەبەر کەسرەی قاف
جێی ئیختیلافە لای قوڕای ئەشراف

هەروەهایە رێ لە (عين القطرِ)
لەبەر کەسرەی قاف (فاقرأها وادر)

زێ حەرفی جەهرەو خاوەن ضەفیرە
چاودێری ئەکا ئەوکەسەی ژیرە

سین پێش حرووفی (جوزە قشط)
ئیظهاری ئەوێ بێشوبهەی غەلەط

باش ئەدابکە حەرفی شین لەگەڵ
حەرفی تێو جیما ئەی برای ئەفضەل

صاد پێش حرووفی (حدة غلط)
ئیظهاری ئەوە لامەدە قەط قەط

جیا بکەرەوە صاد لە حەرفی سین
وەکو سین لە تێ وێنەی (نستعين)

ضاد ئیظهار بکە لەلای حەرفی تێ
جیم و شین و غەین لەگەڵ طێ و ظێ

طێ کە کەوتە پاڵ حەرفی دال و تێ
ئیظهاری حەقە ئەبێ بێتە جێ

ئەگەر طێی گەورە کەوتە پێشی تێ
فەرزە ئیطباقی لەبیرت نەچێ

وەکو (احطتُ) وەکو (بسطتَ)
وێنەی جوانن لێرەدا بەستە

ظێ حەرفی عولوو جەهر و ئیطباقە
چاودێری وەصفی جێی ئیتتیفاقە

جیابکەرەوە بە لەفظی شیرین
ظێ لە حەرفی ذال ئەڵێم ئافەرین

عەینێ ساکن بێ بە وێنەی (مَعْروف)
ئیظهاری فەرزە ئەی برای رەئووف

حەرەکەی عەینی بەینی دوو فەتحە
ئیظهاری بۆ تۆ باعیثی مەدحە

.هەروا حەرفی عەین لەکاتی تەشدید
چا دێری شەددەی فەرزە بەتەجوید

غەینێ ساکن بێ لەپیش صادو شین
ئیظهاری ئەوێ ئەی برای شیرین

حەرفی رەفیقی حەرفی ئیستیعلا
ئیظهاری ئەوێ بیلێ بەرمەلا

فێ لەگەڵ فێدا لەگەڵ میم و واو
هەم لەگەڵ بێدا گرانە تەواو

جێی ئیختیلافە دەربرینی قاف
لە (نخلقکم) دا لای قوڕڕای ئەشراف

بەعزێکیان بە دەغم بەعزێ بە ئیظهار
دەغمە لای حەفصی خاوەن ئیعتیبار

هەروا ریعایەی وەصفەکانی کاف
پێویستە لەبۆ قاریی بەئینصاف

پێویستە ئیظهار لەبۆ قاف و کاف
لە یەك کەلیمەو دوو کەلیمەی صاف

هەروا ئیظهاری دوو کافی ثاوا
حەرەکەدار بن لە بەرو دوا

یەکەم ئەلف کە حەرفی عیللەو مەددو لینەو حەرفێکی هەوائی یە ، پێویستە بە نەرمی لە دەم دەرچێت ئەگەر لەپاش حرووفی سوفلی یەوە بێ ، وەکو باء ، تاب ، جاء ، وەکو پێویستە تەماشای تەفخیمی بکرێ ، ئەگەر لەپاش حرووفی ئیستیعلاوە بێ ، وەکو (قال و غالِبْ و ظالِمِينَ) .

دووەم : هەمزە کە لە حرووفی حەلقەو لە حەرفە گرانەکانە ، پێویستە هەمووکاتێك تەرقیق بکرێو بەنەرم بخوێنرێتەوە ، بەتایبەتی لەگەڵ عەینو حێو هێ دا ، وەکو (أعبُدُ) وە (أحمَدُ) وە (اهدِنا) . یا لەسەر ئیسمی ذات وەکو «الله» .

هەروا پێویستە چاودێری هەمزە بکرێ ئەگەر موتەحەریك بێ لەپاش واوو تێوە وەکو (وإذا) و (تؤذهم) یاخود ساکن بێ لەپاش موتەحەرێکەوە ، وەکو (يؤمِنونَ) . پێویستە هەمزەی دووەم لە هەمزەکانی (أأعجميٌّ) بە تەسهیل بخوێنرێتەوە ، واتە لەبەینی هەمزەو ئەلفدا لەسەر قیرائەتی عاصیم .

سێیەم بێ کە لە حرووفی جەهرە ، پێویستە ریعایەتی لە هەموو شوێنێکدا ، بەڵام تەرقیق ئەکرێو بەنەرمی ئەخوێنرێتەوە لە وێنەی (برق) و (باطل) و (بهم و بها) و (بذی) . ئەگەر ساکن بوو لەپێش میمەوە قەلب ئەکرێ بە میمو بە غوننەوە ئەخوێنرێتەوە وێنەی (اركب مَعَنا) .

چوارەم حەرفی تێ . پێویستە ریعایەت بکرێ لەگەڵ میثلی خۆیدا ، بەمجۆرە دەغم بکرێ لە میثڵەکەیداو بەقووەت بخوێنرێتەوە وێنەی (وتبتَّل) . هەروا ریعایەت بکرێ لەگەڵ سیندا وەکو (نستعين) و (مستقيم) . وە لەگەڵ حەرفی شینو جیمو زێو صادو ضادو طێو ظێ دا وەکو : اشْتَرىٰ ، وَلاتَجِد ، وتَزدَري ، وتَصْبِرُونَ ، وتَضرِبونَ ، فاذا تَطَهَّرْنَ ، وتُظاهرونَ .

هەروا پێویستە تێی تەئنیثی ساکینە دەغم بکرێ لە دالو تێو طێ دا ، وەکو : أجيبَتْ دَعْوتكما ، فما ربحتْ تِجارَتهم ، وَدَّتْ طائِفةٌ .

ئیمامی حەفص ئیظهاری تێی تەئنیثی ساکینە ئەکا لەپێش جیم و ثێ و زێ و سین و صادو ظێ دا ، وێنەی : نَضِجَتْ جُلودُهم ، كذَّبَت ثَمودُ ، خبَت زِدْناهُمْ ، انُـزلَتْ سوُرَةٌ ، حَصِرَتْ صُدورُهم ، كـانَتْ ظالمَةً .

پێنجەم حەرفی ثێ پێویستە ریعایەتی مەخرەج و ئەدای بکرێ و پێویستە ئیظهاری لەپێش حەرفی تێدا وێنەی : (لَبِثْتم و اورثْتم) وە لەلای حەفص دەغم ئەکرێ لە ذالدا وەکو : (يَلهَثْ ذلك) .

شەشەم حەرفی جیم کە لە حرووفی قەلقەلەیە ، پێویستە ریعایەتی جەهرو شیددەتی بکرێ ، مەخسوس کاتێ ساکن بێت و بکەوێتە پێش تێ و دال و ذال و رێ و زێ و سین و لام ، وێنەی : اجتَنِبوا ، أجْدَر ، مجذوذ ، تَجْري ، لاتجْزي ، أجسامُهم ، فاجْلدِوا ، وَلاتجهَروا .

حەوتەم حەرفی حێ کە لە حرووفی حەلقە ، پێویستە ریعایەتی بکرێ ، مەخسووس لە صادو قاف و طێ دا ، وێنەی : حَصْحَصَ الحقُّ ، حِطَّةٌ ، حَقٌّ .

هەشتەم حەرفی خێ ریعایەتی پێویستە ، بەتایبەتی کاتێ کە موشەددەد بێ ، وەکو : سَخَّرْنا .

نۆیەم حەرفی دالە کە لە حرووفی قەلقەلەیەو حەرفی جەهرو شیددەتە ، ریعایەتی پێویستە بەم شێوە کە دەغم بکرێ لە وێنەی خۆیدا ، وەکو : وقَدْ دَخلوا . وە لە تێدا ، وەکو : لقَدْ تابَ الله . وە ئیظهاری بکرێ لەپێش حرووفی (بل نفخر) وەکو : فقد باء ، وَلقَـدْ لَقينا ، قَـدْ نَرىٰ ، فقَدْ فازَ ، وقَدْ خابَ ، لقَدْ رأى .

ئیمامی حەفص ئیظهاری ئەکا لەپێش ئەم حەرفانەدا : جیم ، ذال ، زێ ، صاد ، ضاد ، سین ، شین ، ظێ ، میثالەکانی : قَدْ جاءَكم ، لقَدْ ذرأنا ، لقَدْ زيّنا ، لقَدْ صَرَّفنا ، قَدْ ضَلّوا ، قَدْ سَمعَ الله ، قَدْ شَغَفَها حُبّاً ، لقَدْ ظَلَمكَ .

دەیەم حەرفی ذالە کە لە حرووفی جەهرو شیددەتە ، پێویستە لە

مەخرەجەوە باش دەربکرێ ، وە دەغم ئەکرێ لە وێنەی خۆیدا وەکو : إذْ ذَهبَ . وە لە ظێ دا وەکو : إذْ ظَلَمتُم .

ئیمامی حەفص ئیظهاری ئەکا لەگەڵ ئەم حەرفانەدا کە عیبارەتن لـە : تێ و جیم و دال و رێ و زێ و سین و صـاد ، میثالـەکـان : إذ تَبـرَّأ الّذينَ ، إذ جاءَكم ، إذْ دَخلوا ، إذ رَأى ، إذْ سَمِعْتموهُ ، إذ صَرَفنا .

یازدەیەم حەرفی رێیە کە حەرفی جەهرو تەوەسسوط و تـەکرارو ئینحیرافە . پێویستە تەماشای ئەم صیفەتانەی بکرێ مـەخسوس کـاتێ موشەددەد بێ ، وەکو : اذ تَبرَّأ ، وە واجبە ئیظهار بکرێ لەپێش نوون و لامەوە ، وێنەی : وَقَرنَ في بيوتكنَّ ، واستَغفِرْ لَهُنَّ ، جا ئەگە مەضمووم یا مەفتووح بوو ئەوە تەفخیمی واجبە ، ئەگە مەکسووریش بوو واجبە تەرقیقی ، خواە کەسرەکەی ئەصڵی بێ یا عـاریض بێ حەتتـا بەهـۆی ئیمالەوە ، وەك : مَجْريها ، یاخود بە واسیطەی رەوم یا ئیختیلاس بێت ، وەکو لە وەقفدا بەیان ئەکرێن . ئەگەر ساکنیش بێ ئەوە تەرقیقی واجبە لە پێنج حالا : یەکەم ئەوەیە کە لەپێشـەوە کەسـرەیەکی لازمی ئـەصڵی موتتەصیل ببێ ، وەکو : رسالات رَبّي . دووەم ئەوەیـە کە سـاکن بێ لەپاش کەسرەی موتتەصیلەوە ، وەکو : مِرْية . سێیەم ئەوەیە لـەپاش کەسرەیەکەوە بێ کە فەصڵ لەبەینیاندا ببێ بە ساکنێ غەیری حەرفی یێ بێ وەکو : ذِكْر و سِحْر . لە حاڵی وەقفدا لەسەر ئەو حەرفی رێیە . چوارەم ئەوەیە کە لەپاش کەسرە یەکەوە بێ کە فاصیل لەبەینیاندا یێی ساکینە بێ ، وەکو : خبير ، قدير ، بصير . بەوەقفە لەسەر رێ . پێنجەم ئەوەیە کە لە پاش ئەلفێکەوە بێ ئیمالە بکرێ ، وەکو : في الْغار ، کە لە ئیمالەدا ئەبێ بە : في الغێر .

بەڵێ ئیختیلافی قاریئەکان هەیە لە کەلیمەی : فِرق وقِطر ، بـە کەسرەی حەرفی ئەووەڵ ، بەعزێ تەفخیمی رێ ئەکا ، چونکی حەرفی ئیستیعلاء موعاریضی تەرقیقە ، بەعزێ تەرقیقی ئەکا لەبەر کـەسرەی ماقەبلی رێ و موبالات ناکا بە حەرفی ئیستیعلاء لەدواوە .

جا بینا لەسەر ئەو قەواعیـدەی رابووران واجبـە تەفخیمی رێی

(ارجعوا) و (ام ارْتابوا) و (الذي ارتضىْ) ، چونكى كەسرەى هەمزەى ارجعوا ، لازم نيەو كـەسرەى ميمى ام ارتـابو ، عـاريضەو كـەسرەى ذالى : الذى ارتضى ، فەصلْ بووە لە رێكە بە پێى الذى ، هەرچەند لە تەلەففوظدا لاچووە لەبەر (التقاء الساكْنين) .

دوازدەيەم حەرفى زێيە كە حەرفى جەهرو صەفيـرو شيددەتـەو ريعايەتى ئەو صيفەتانەى واجبە ، مەخسوس فەرق كردن لەبەينى خۆىو ظێى گەورەدا .

سيازدەيەم حەرفى سينە كە حەرفى جەهرو صەفيرو شيـددەتە ، ريعـايەتى صيفـەتەكـانى واجبە و پێـويستە ئيـظهار بكـرێ لە گـەلْ ئەم حـەرفـانـەدا : تێ ، جيم ، رێ ، زێ ، شـين ، طێ ، قـاف . ميثـالەكـانى : نستعين ، مسجـد ، وإذا النفوس زُوِّجَت ، مسـرورا ، واشتعل الرأس شيباً ، ويَسطون ، ويُسقَون .

چواردەيەم حەرفى شينە كە لە حەرفى هەمسو رەخاوەتە ، پێويستە ريعـايەتى صيفـاتىو پێويستـە ئيظهـارى لەگـەلْ : تێو جيمدا وەكـو : (يَشترونَ) و (تشابَهتْ) و (شجرة) .

پازدەيەم حەرفى صادە كە لە حورووفى هەمسو شيددەتە ريعايەتى صيفەتەكانى پێويستەو ئيظهارى واجبە لـەگەلْ ئـەم حەرفـانەدا : تێ ، حێ ، دال ، صـاد ، طێ ، غـەين . ميثـالـەكـانى : حـرصتم ، أصحاب ، أصَّدَّقَ ، واصْطبر ، ولتَصْغى .

شازدەيەم حەرفى ضادە كە لە حرووفى جەهرو شيددەتە ريعايەتى صيفەتەكانى واجبە ، مەخسوس لەگەلْ ئەم حەرفانەدا : تێ ، جيم ، طێ ، ظێ ، غەين . ميثالـەكانى : أفضتم ، فى المضـاجع واضـطرّ ، وانقضَ ظَهرَكَ ، ضغثاً .

حەڤدەيـەم حەرفى طێيـە كە لـە حرووفى جـەهرو شيـددەتو ئيطباقە ، پێويستە ئيظهارى لەگەلْ تێى بچووكـدا وەكو : تَـطَهَّرْنَ ، و أحطتُ و بَسطتُ ، وە لەگەلْ دالدا .

هەژدەیەم حەرفی ظێ یە کە لە حرووفی جەهرو شیددەت و ئیطباقە ، پێویستە ریعایەتی صیفەتەکانی و بەنەوعێ ئەدا بکرێ کە جیابکرێتەوە لە ذال .

نۆزدەیەم حەرفی عەینە کە لە حرووفی حەلقەو پێویستە ریعایەتی بکرێ ، مەخسوس کاتێ کە موشەددەد بێ وەکو : يَصَّعَّدُ ، یا ساکن بێ لەبەینی دوو موتەحەریکدا ، وەکو : بالمعروف . یا مەفتووح بێ لەبەینی دوو موتەحەریکدا ، وەکو : وَعَدَ اللهُ الذينَ آمَنُوا .

بیستەم حەرفی غەینە ، ئیظهاری پێویستە بەتایبەتی کاتێ کە ساکن بێ و لەپێش ضادەوە بێ وەکو : المغضوب . یا لەپاش شینەوە بێ ، وەکو : يغشى ، هەروا ئەگەر لەگەڵ حرووفی ئیستیعلادا بێ ، وەکو : (غضبَ الله) و (غَضْبا) .

بیستویەکەم حەرفی فێیە ، ئیظهاری پێویستە کە لەگەڵ : بێو میم و واودا بێ ، وێنەی : (فبما رحمة) و (يعلم المفسد) و (لَمُوَفُّوهُم أجْرَهُم) .

بیست ودووەم حەرفی قافە لە حرووفی قەلقەلەیە ئیظهاری واجبە ، مەخسوس کاتێ ساکن بێ ، یا لەگەڵ کافدا بێ ، وەکو : خَلَقَكم . لە قافی ساکندا لەپێش کافەوە قاریئەکان ئیختیلافیان بووە لە دەغمداو لە ئیظهاردا ، بەڵام ئیمامی حەفص ئیختیاری دەغمی قاف لە کافدا ئەکا .

بیستوسێیەم حەرفی کافە ، پێویستە ریعایەتی ، مەخسوس ئەگەر لەگەڵ کافێکی تردا بکەوێتە یەك و هەردووکیان موتەحەریك بن ، وەکو : ماسَلَكَكُمْ في سَقَر .

# دەرزی نۆزدەیەم

لام لەگەڵ نوونا یا لامی مەکسوور
وەکو : (لله) و وەکو : (لَن تَبور)

هەردوو لامانی : (وليَتَلَطَّفْ)
تەوقیفیان بکەی ئەگەی بە شەرەف

سکوونی لامی لەفظی (أنْزَلْنا)
ئیظهاری ئەوێ بەقەد توانا

لامی بینای فیعل ئیظهاری فەرزە
وەربگرە لە من ئەم دەرزە بەرزە

وەکو (قل نعم ، التقى ، وقال ،
ضللنا إذا لم نرعَ الكمال)

ماضی و موضاریع ئەمر یەکسانە
مەر لە دوو جێدا باشیان بزانە

یەکەم لەگەڵ لام دووەم حەرفی رێ
لەسەر یاسای دەغم با دەغم بکرێ

لامێ کەوتەسەر ئیسمی جەلالە
ئیظهاری بەحەق حوسنی فیعالە

وه‌كو (على الله) هه‌م لامی (ولا)
له‌ (ولا الضالّين) ئه‌ی برای والا

لامێ ساكن بێ ده‌غمی كه‌ له‌ رێ
ته‌نیا (بَلْ رانَ) ئیستیثنا ئه‌كرێ

لامی (بل) و (هل) لای حه‌فصی ئیمام
له‌پێش ئه‌م هه‌شتا ظاهیره‌ ته‌مام

تێ ، ثێ ، زێ‌و سین ، ضادو طاءو نوون
وێنه‌ی له‌شه‌رحان به‌ بێ چه‌ندو چوون

میم جه‌هرو شه‌دده‌ ته‌واو بێنه‌جێ
هه‌روا غونن‌ه‌یشی كه‌ موشه‌دده‌د بێ

میمی زه‌نه‌دار كه‌وته‌ پێشی بێ
ئه‌بێ غوننه‌كه‌ی به‌ ئیخفاوه‌ بێ

به‌ڵام كه‌وته‌ پێش باقی حه‌رفه‌كان
ئیظهاری فه‌رزه‌ لای قاریئه‌كان

مه‌خسوس كه‌ گه‌یشت به‌ واوو به‌ فێ
ئیظهاری به‌ لێو فه‌رزه‌ بێته‌جێ

له‌ هه‌رشوێنێكدا میمت كه‌وته‌ ده‌م
ته‌رقیقی فه‌رزه‌ برای موحته‌ره‌م

لام له حرووفی جەهرو تەوەسسوطە ، پێویستە تەرقیق بکرێ له چەند شوێندا . یەکەم کاتێ که مەکسوور بێ وەکو لامی : (لله) . دووەم : کاتێ لەپاش مەکسوورەوە بێ وەکو لامی ئیسمی جەلاله لەپاش لامی حەرفی جەرەوە ، وەکو : (لله) . سێیەم : کاتێ که لەگەڵ نووندا بێ وەکو : (لنا) و (أنزلنا) و (لن تبور) . چوارەم : لامەکانی (وليتلطّف) . پێنجەم : لامێ که لەبینای فیعلدا بێ تێکرا ، وەکو : قالَ ، يَقولُ ، قُلْ . شەشەم : کاتێ که ساکن بێ و نوون لەدواپەوە ببێ ، وەکو : قل نعم . حەوتەم : لامی نافیەی (ولا الضالّين) . هەشتەم : لامێ که داخل ببێ لەسەر ئیسمی جەلاله ، وەکو : (إلى الله) و (على الله) .

هەروا پێویستە بۆ لامێ کە ساکن بێ لەپێش حەرفی رێوە دەغم بکرێ لەو رێدا ، وەکو : (وقُلْ رَبِّ زِدني عِلماً . وقُلْ رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَم) . بەلام جوملەی : (بَلْ رَانَ) جیاکراوەتەوە لەو قاعیدەیەو لامەکەی دەغم ناکرێ لە رێدا ، نەکا کەلیمەی : (بل) بۆ ئیضراب لەگەڵ فیعلی ماضیدا ئیلتیباسی ببێ بە تەثنیەی (برّ) ەوە . میثالی ئیظهاری لامی (بل) و (هل) لەپێش ئەو هەشت حەرفانەوە کە وتمان ، وەکو : (هل تأتيهم) و (هل ثُوِّبَ الكفّار) و (بَلْ زُيِّنَ) و (بَلْ سَوَّلَت) و (بل ضَلّوا) و (بل طُبِعَ) و (بَلْ ظَنَنْتُم) و (هَلْ نَدُلُّكم) .

تائیستە باسمان لە لامی تەعریف نەبوو . حوکمی لامی تەعریف ئەوەیە کە دەغم بکرێ لە چواردە حەرف لە حرووفی هیجاء : تێ ، ثێ ، دال ، ذال ، رێ ، زێ ، سین ، شین ، صاد ، ضاد ، طێ ، ظێ ، لام ، نوون ، وەکو : التّوبة ، الثّواب ، الدّين ، الذّكر ، الرّزق ، السّمع ، الشّهادة ، الصّبر ، الضّالّين . الطّيبات ، الظالمين ، اللّؤلؤ ، النجم . ئەم لامە لەسەر ئەم حەرفانە پێی ئەڵێن لامی شەمسیە .

لامی تەعریف لەگەڵ غەیری ئەم حەرفانەدا ئیظهار ئەکرێ ، وەکو : القمر ، الجنّە ، الحمد ، الخير ، العلم . هەروەها ئەوانی تریش . ئەم لامە پێی ئەڵێن لامی قەمەرییە چونکی وەکو لامی :

القمر ، وایەو دەغم ناکرێ لەوحەرفەدا کە ئەلکێ پێ یەوە .

بیست‌وپینجەم : میمە کە حەرفی جەهرو شیددەتە ، ریعایەتی صیفەتەکانی واجبەو پێویستە ئیخفاء بکرێ لەوکاتەدا بکەوێتە پێش حەرفی بێ ، وەکو (جَزيناهُمْ بِما كفَروا) وە ئیظهار بکرێ لەپێش باقی حرووفی هیجاوە ، مەخسوس لەپێش فێ وە ، وەکو : (لَهُمْ فيها) و لەپێش واویشەوە ، وەکو : (غير المغضوب عليهم ولا الضالين) . ئەم ئیظهارە لەم شوێنەدا ناوئەبرێ بە ئیظهاری شەفەوی .

# دەرزی بیستەم

نوون حەرفی جەهرەو بە لین مەوصوفە
وەصفی غوننەکەی بە حەق مەعرووفە

دەربرە غوننەی نوونی موشەددەد
تەرقیق بۆ نوونی (إنّا) تائەبەد

ئیظهاری زەنەی نوونی (أنْعمتَ)
غەینی (المَغْضوب) بۆ تەجوید بەستە

نوونی ساکینەو تەنوین بە هەردوو
چوار حاڵەت هەیە بیانزانە زوو

ئیظهارو قەلب و ئیخفاو ئیددیغام
بەیانیان ئەکەم بۆ غایەی ئیفهام

فەرزە ئیظهاریان بۆ حەرفی گەروو
لە لەفظێکدا بن یاخود لەناو دوو

(ینأون . ینهون) بۆ وێنەی یەکەم
(من أمر . منهم) بۆ وێنەی دووەم

(حفیظٌ عَلیهم) بۆ وێنەی تەنوین
(فخذه وکن من الشاکرین)

قەلب ئەکرێن بە میم لەپێشی بێ دا
لەگەڵ غوننەداو ئیخفا لەجێدا

(مِنْ بَعد) وێنەی قەلبی یەکەمە
(سمیعٌ بَصیر) وێنەی دووەمە

دەغم ئەکرێن لەگەڵ غوننە بەتەصمیم
لە واوو یێ دا هەم لە نوون و میم

لەبەر ئیلتیباس ئیستیثنا کران
(بنیانٌ ، دُنیا ، قِنوانٌ ، صِنوان)

دەغمیش ئەکرێن لە لام و رێ دا
غوننە حەرامە بەڵام لەوجێدا

لاکین (مَنْ راق) لای حەفصی ئیمام
شوێنی ئیظهارە نەك جێی ئیددیغام

ئیخفای تەنوین و نوونی زەنەدار
لا باقی حرووف فەرزە بەقەرار

نوون حەرفی جەهرو تەوەسسطو غوننەیە ، وە لە لەفظی (انّا) دا تەرقیقی پێویستە ، وە لەکاتی سکووندا ئیظهاری لازمە ، وێنەی : (أنعمت) . وەکو چۆن غەینی ساکن لە : (غَیْرِ المَغْضُوبِ) دا ئیظهاری پێویستە .

جابزانن ئەحوالی تەنوین و نوونی ساکینە چوارن : ئیظهار . ئیدغام . قەلب ، ئیخفای (مع الغنه) . ئیظهاریان واجبە لەگەڵ حرووفی حەلقدا ، خواە ئەو نوونە ساکینە لەگەڵ حەرفە حەلقەکەدا لە یەك کەلیمەدا بن ، وەکو : یَنأونَ و یَنهَوْنَ . یا لە دوو کەلیمەدا بن ، وەکو : مِنْ أمر ومنهم . میثالی تەنوین لەگەڵ ئەم حەرفانەدا ـ کە لە واقیعدا ئەوان لە دوو کەلیمەدا ئەبن ـ وەکو : حَفیظٌ عَلیمٌ . هەموو میثالەکان : مِنْ أمْرنا . رَسولٌ أمینٌ . مِنْ هادٍ . سَلامٌ هِيَ . أنْعَمتَ . سَمیعٌ علیمٌ . إنْ حَکَمتُم ، غَفورٌ حَلیمٌ . مِنْ غَلّ . عَزیزٌ غَفورٌ . مِنْ خیْرٍ . قِرَدَةً خاسِئین .

ئیدغامیان ئەکرێ کاتێ بکەونە پێش حرووفی : (یَرْملونَ)ەوە ، بەڵام دەغمیان لە لام و رێدا بێغوننەیە و لە یێ و میم و واوو نووندا بەغوننە دەبێ ، میثالی دەغمی بێغوننە وەکو : مِنْ لَدُنّا . یَوْمَئِذٍ لَخبیر . مِنْ رَبِکّم . مِنْ رَبٍّ رَحیم . میثالی دەغمی بەغوننەیش وەکو : فَمَنْ یَعْمَل . یَوْمَئِذٍ یَصْدُر . مِنْ وَاقٍ . جنّاتٍ وعُیون . مِنْ مَحیص . صِراطٍ مُستقیم . مَنْ نَشاء . عَذاباً نُکرا .

قەلبیان دێتەجێ ، بەمجۆرە قەلبی تەنوین و نوونی ساکینە ئەکرێ بە میم کاتێ کە بکەونە پێش حەرفی بێوە ، وەکو : (مِنْ بَعْد) و (سمیعٌ بَصیر) .

ئیخفایش ئەکرێن لەپێش غەیری ئەو حەرفانە کە باسیان کرا ، وەکو : لَنْ تَنالوا البِرَّ . جَنّاتٍ تجري . مِنْ ثُلُثَي الليل . ماءً ثجّاجا . مَنْ جاءَ . كثيراً جَزاءً . عِنْدَ رَبِّهِم . دَكّاً دَكّاً . مُنْذِر . جَنّاتِ عَدْنٍ ذلك . مِنْ زَوال . يَوْمَئِذٍ زرقا . مِنْ سُوءٍ . بَشَراً سَوِيّاً . مِنْ شَيئٍ . غَفورٌ شَكورٌ . مِنْ صَياصِيهِم . رِجالٌ صَدَقوا . مَنْضود . قوماً ضالّين . مِنْ طُور . قوماً طاغين . مِنْ ظهير . قوماً ظالمين ، أنْفُسَكم . كِتاباً فَذوقوا . مِنْ قرار . شاعر قليلا . مَنْ كان . في يَومٍ كان .

هێی (جباهُهم) لەگەڵ (عالِيه)
هێی (يَعلَمُهُ) لەگەڵ (مالِيه)

ئیظهاریان لەسەر یاسای تەجویدە
تەجوید کردەوەی قاریی رەشیدە
دەربرە دوو یێ کە موتەحەررێك بن
با لە شەکڵیشدا ناموافیق بن

ئەو یێ مەکسوورەو لەپاش مەفتوحە
عەکسیشی ئیظهار بۆ ئەو مەمدووحە

یێی موتەحەررێك ماقەبلی ساکن
حەقی ئیظهارە باش ئاگادار بن

زەنە دەربرە لەپێش هەمزەو هێ
لەپێش عەین و نوون ئاگات لە خۆت بێ

هەموو حوکمی یێ هەیە لەبۆ واو
پێویستە بۆ تۆ چاودێری تەواو

هێ لـه حرووفی حـه‌لقه‌و هـه‌مسه ، واجبـه ئیظهـاری بکرێ ، مه‌خسوس کاتێ که دوو هێ بکه‌ونه یه‌ك ، وه‌کو : جِباهُهُم .

ئیظهاری یێ واجبه مه‌خسوس ئه‌گه‌ر مه‌کسوور بێ له‌پاش فه‌تحه‌وه یا مه‌فتووح بێ له‌پاش که‌سره‌وه ، هه‌روا ئه‌گه‌ر موته‌حه‌رریك بێ له‌پاش ساکنه‌وه به‌مه‌رجێ ئه‌و ساکنه ته‌نوین‌و نوونی ساکینه نـه‌بێ . وه واجبه سکوونه‌که‌ی ده‌رببرڕێ کاتێ له‌پێش هه‌مزه‌وه بێ ، وه‌کو : لاتَيْأسُوا . یا له‌پاش هێ‌وه بێ وه‌کو : فيه . یا له‌پێش نوونه‌وه بێ . وه‌کو : أيْنَ المفَرّ . یا له‌پێش عه‌ینه‌وه بێ وه‌کو : فی عين . حه‌رفی واو له ئه‌حکامدا وه‌کو یێ وایه .

## به‌عزێ یاسای گشتی

نه‌رمی و ناسکی حرووفی سوفلی
ڕابگره به حه‌ق به موعته‌دیلی

ته‌فخیمی حه‌رفی ئیستیعلاو ئیطباق
حومکی قوڕایه (على الاتّفاق)

حه‌رفی قه‌لقه‌له ئه‌بێ ظاهیر بێ
به‌تایبه‌ت کاتێ زه‌نه‌ی دائیر بێ

له زه‌نه‌ی وه‌قفا قه‌لقه‌له‌ی کوبران
له زه‌نه‌ی حه‌رفا قه‌لقه‌له‌ی صوغران

(الله أحَدْ) وێنه‌ی یه‌که‌مه
(أقْرَبُ إلَيه) وێنه‌ی دووه‌مه

لەمەوپێش باسی چاودێری صیفاتی یەکە یەکەی حرووی ـێـ.
کرد ، لێرەیش بەشێوەی گشتی باسی صیفەتی بەعزە کۆمەڵـە حرووفێ ئەکەین :

حرووفی سوفلی کە غەیری حرووفی ئیستیعلان ، پێویستە تەماشای سووکیی و ئیستیفالەیان بکرێ . حرووفی ئیستیعلاء ڕیعایەتی عولوییەتیان بکرێ ، بەتایبەتی حەرفە ئیطباقەکان ، زۆر ڕیعایەتیان لازمە . پێویستە ڕیعایەتی حرووفی قەلقەلە بکرێ و باش دەرببرڕێن . بەتایبەتی کاتێ ساکن بن و لە کاتی سکوونی وەقفدا زۆرتر مولاحەظەیان بکرێ . بـە حەرفی ساکنی ناو کەلیمە وەکو قافی (أقْرب إليه) ئەڵێن : قەلقەلەی صوغرا . بە ساکنی حاڵی وەقف ئەڵێن : قەلقەلەی کوبرا ، وەکو (الله أحَدْ) .

## دەرزی بیست و یەکەم

ئیدغام ئەمەیە حەرفی زەنەدار
گوم بکەی تەواو لە حەرەکەدار

موتەماثیل بن یا موتەقاریب
یا موتەجانیس ئەی برای طالیب

بەعنی سێ بەشە بەشی یەکەمیان
دێتە جێ لەناو موتەماثیلان

موتەماثیلان دوو حەرفی وەهان
یەك بێ صیفەت و مەخرەجەکەیان

حوکمی وجووبە بە یاسای تەجوید
(اضربْ بِعَصاك) کەلامی مەجید

بەشی دووەمین دەغمی دێتەجێ
لەناو دوو حەرفا موتەقاریب بێ

موتەقاریبەین دوو حەرفی ئاوان
نزیك بێ لە یەك وەصف و مەخرەجیان

(یَلهَثْ ذلك . ارْكَبْ مَعنا .
أَلَمْ نَخلقْكُم) وێنەن لەم شوێنا

بەشی سێیەمیان موتەجانیسان
صیفەتیان جیایە مەخرەجیان یەكسان

(وَدَّتْ طائِفه) میثالی وایە
بۆ دەغمی هاوجینس ڕووناكی تیایە

كە گردەوەبوون موتەماثیلەین
یاخود دوو حەرفی موتەقاریبەین

هەروا دوو حەرفی موتەجانیسەین
وەكو وەرتگرت لەسەر میثالەین

مادام ساكن بێ یەكەم لەوانا
دەغمی پێویستە لە دووەمیانا

گەلێ نموونەی بەشێوەی مەعرووف
ڕابووردن لەسەر چاودێری حرووف

لای ئیمامی حەفص لامی (بَلْ رانَ)
حوکمی ئیظهارە زوویش وتوومانە

هەم ئیظهارە حوکم نەوەك ئیددیغام
لەم چەن میثالەی مەشهوورن لای عام

لەفظی (سبِّحە) لەگەڵ (قُلْ نعَمَ .
هُمْ فَالتَقَمَهُ . فِي يَوْم . أهَمَّ)

هەروا (لاتُزِغْ قُلوبَنا بَعْد
إذْ هَدَيْتَنا) يا صادق الوعد

ئیدغامی کەبیر وەها دێتەجێ
یەکەم وەك دووەم موتەحەڕریك بێ

خواه لە حەرفەینی موتەماثیلەین
یاخود حەرفەینی موتەقاریبەین

وەکو : (تَأمَنّا . مكّنّا . خذها
على مَسلك الحفص المقتَدى)

ئیدغام لە عورفی ئەهلی تەجویدا ئەوەیە : دوو حەرف تێکەڵ بکەی بە یەك و بەهێز بەجارێ بیانخوێنیتەوە ، جا ئیدغام بە ئیعتیباری مودغەم و مودغەمو فیهی لەسەر سێ بەشە : یەکەم ئیدغامی موتەماثیلەین ، کە بریتی یە لە داخڵ کردنی حەرفێکی ساکن لە حەرفێکی موتەحەڕریکدا ، بەمەرجێ ئەو دوو حەرفە لەوێنەی یەك بن هاو

مەخرەج و هاوصیفەت بن ، وەکو : دوو بێ لە میثالی : اضرِبْ بِعَصاكَ الحَجَر . وە دوو لام لە میثالی : بَلْ لايَخافونَ . وە دوو ذال لە میثالی : إذْ ذَهَب . وهكذا . دووەم ئیدغامی موتەقاریبەین کە عیبارەتە لەوە : دوو حەرف هاووێنە نەبن ، بەڵام نزیك بن لە یەك لە مەخرەج و صیفەتداو یەکەمیان دەغم بکەی لە دووەمیاندا ، وەکو دەغمی حەرفی ثێ لە ذالدا لە جوملەی : یلهث ذلك . وە دەغمی بێ لە میمدا لە جوملەی : ارْكَبْ مَعَنا . وە دەغمی قاف لە کافدا لە جوملەی : أَلَمْ نَخلُقْكم . سێیەم ئیدغامی موتەجانیسەین کە عیبارەتە لە : دەغمی حەرفێ لە حەرفێکی وەهادا کە نە هاووێنەو نە نزیکی یەك بن ، بەڵکو هاوجینس بن ، وەکو : تێ و طێي گەورە لە میثالی : وَدَّتْ طائِفَة . وە تێ و دال لە میثالی : فَلَمّا اثْقَلَتْ دَعَوا الله . وە لام و رێ لە میثالی : وَقُلْ رَبِّ . وە ذال و ظێ لە میثالی : إذْ ظَلَموا أنفسَهُمْ . وە میثالی ئەم نەوعە دەغمانەمان وت لە باسی چاودێری صیفاتی حرووفدا ، کە لە چ شوێنێکدا دەغم هەیەو لە چ شوێنێکدا نیە . جا مادام دوو حەرف لەم سێ بەشانە کەوتنە یەك و ئەووەڵ ساکن و دووەم موتەحەرریك بوو ئەوە دەغمی یەکەم لە دووەمدا پێویستە لەسەر ئەو تەفصیلە کە باسمان کرد . بەڵام حەفص (رحمه الله) چەن ماددەیەکی جیاکردووەتەوەو ئیدغامی تێدا نەکردووە . لە بەشی موتەماثیلەیندا ، وەکو : فِي يَوْمٍ . کە دەغمی یێی (فِي)ی نەکردووە لە یێی (یوم) دا . وە لە موتەقاریبەیندا وەکو : هُمْ فَالتَقَمَهُ . کە دەغمی میمی (هم) نەکراوە لە فێی (فالتقَمَهُ) دا . وە (قل نعم) کە دەغمی لامی (قل) نەکراوە لە نوونی (نعم) دا . وە وەکو : (سبِّحه) کە دەغمی حێی نەکردووە لە هێدا . وە میثالی (لاتُزِغْ قُلوبَنا) کە دەغمی غەین نەکراوە لە قافدا لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حەرفانە بە موتەقاریبەین ئەژمێررێن . ئەمە تائیستە باسی ئیدغامی دوو حەرفی ئەووەڵ ساکن و ثانی موتەحەرریك بوو ، کە بە ئیدغامی صەغیر مەشهوورە .

ئەمما ئیدغامی کەبیر ئەوە عیبارەتە لەوە : دوو حەرفی

موتەحەرریك بکەونەیەك و دەغمی ئەووەڵ بکرێ لە دووەمدا ، خواە ئەو دوو حەرفە موتەماثیلەین بن ، وەکو میثالی : مَا لَكَ لاتَأْمَنّا عَلى يُوسُفَ کە ئەصڵەکەی (لاتَأْمَنُنا) بووە بە رەفعەی نوونی لامولفیعل و فەتحەی نوونی ضەمیری موتەکەللیمی (مع الغیر) و دەغمی یەکەم کراوە لە دووەمدا . یا میثالی : ما مَكَّنِّي فيهِ رَبّي . کە ئەصڵەکەی (مَكَّنَني) بووە لە بابی تەفعیل و نوونی ئەووەڵ مەفتووح و نوونی دووەم مەکسوور بووەو دەغمی ئەووەڵ کراوە لە ثانیدا . یا ئەو دوو حەرفە لە موتەقاریبەین بن .

ئەم ئیدغامی کەبیرە لەسەر مەذهەبی ئەبوعەمر جاری‌یەو دێتەجێ لە هەموو قورئاندا ، بەڵام لەسەر مەذهەبی حەفص تەنیا لە دوو شوێندا هەیە کە یەکەمیان لە سوورەتی (یوسف) دایەو دووەمیان لە سوورەتی (الكهف) دایە . هەروەها بزانن کە ئیمامی حەفص لە جوملەی (لاتَأْمَنّا) دا ئیشمام ئەکا . واتە لە کاتی تەلەففوظ بە نوونە موشەددەدەکەدا لێوەکانی ئەلکێنێ پێکەوە بۆ ئیشارە ئەلای ئەوە کە ئەو نوونە ، وەختی خۆی مەضمووم بووە ؛ چونکی حەرفی (لا) نافیەیەو عەمەل ناکاو ناهیە نیە .

## دەرزی بیست و دووەم (مَدّ)

مەد مانای توولە بە هەرچۆنێك بێ
لە هەر لەفظێکداو لە هەر شوێنێك بێ

یا خۆبەخۆیەو سەبەبی نی‌یە
ئەم مەدە ناوی طەبعی و ئەصلی‌یە

یانی بە بێ‌مەد بوونی نایابە
(قال ، يَقولُ ، قيلَ) یا بابە

ئەندازەی توولی بە قەد ئەلفێکە
چون دوو حەرەکەی مادەی حەرفێکە

یا سەبەب داره هەمزە یا سکوون
لەمە دەرناچێ لە ڕوبعی مەسکوون

توولی زیاترە لە مەددی ئەصلی
ناوی فەرعی یەو عاریضی جەلی

ئەوەی سەبەبی هەمزەیە ئەگەر
لە عەینی لەفظا هاتە بەر نەظەر

مەددی واجبی موتتەصیل ناوە
لەبۆ ئەم مەدە هەتاکو ماوە

میثالی (السوء ، جیئ ، و جاء)
موتەواتەری نەقلی قوڕائە

بە دوو ئەلف و نیو بە پێنج حەرەکات
طوولی پێ ئەدەن ئەهلی قیرائات

ئەوەیش هەمزەکەی لە لەفظی ثانی
ثابیتە برام ئەبێ بیزانی

مەددی جائیزی مونفەصیل ناوە
لەبۆ ئەم مەددە تا دونیا ماوە

(قوُا أنفسُكم ، يا أيّها الناس ،
فِي أيْمانِكم) سێ میثالن خاص

ئەندازەی کاتی حەدرو ئیستیعجال
بە وێنەی طەبیعی دیتە سەرمەقال

بۆ کاتی تەدویر بە چوار حەرەکات
یانی دوو ئەلف طوولی پێ ئەگات

کاتی تەرتیل و تەجویدی کامیل
دوو ئەلف و نیوە ئەی برای فاضیل

## ئەوەی سەبەبەکەی سکوونە

ئەوەیش سەبەبی سکوونە هەروا
دوو بەشی ساغە بێشوبهەو هەوا

یا سەبەبەکەی لازمی ذاتە
یا لەبەر وەقفەو لە عاریضاتە

یەکەم چوار بەشە بە یاسای تەرتیب
بۆت بەیان ئەکەم ئەی برای نەجیب

بەشی یەکەمیان لە ماددەی تەنزیل
مەددی لازمی کەلیمی ئەقیل

هەیە لەپاش مەد ساكنێكی وا
دەغم كراوە لە حەرفی دوا

بە (وَلا الضّالّین) بە (طامّە) و (صاخّە)
هاتوە وێنەیان ئەڵێی گوڵباخە

ئەندازەی طوولی شەش حەرەكاتە
یانی بە سێ ئەلف مەددی ئەصواتە

بەشی دووەمیان ئەی برای شەریف
مەددی لازمی كەلیمی خەفیف

لێرا لەپاش مەد حەرفی زەنەدار
دەغم نەكراوە دیارە بەقەرار

وەكو : (آلآن وقد عَصَیتَ)
مەددی سێ ئەلفە بیزانە بەستە

بەشی سێیەمیان بە بێدەخیلە
مەددی لازمی حەرفی ئەقیلە

شوێنی حەرفێكە (فواتح) ماوا
هیجاء سێ حەرفی مەددی لەناوا

مابەعدی مەددیش دەغم كراوە
بە (ألف ، لام ، میم) وێنەی تەواوە

بەشی چوارەمین ئەی برای شەریف
مەددی لازمی حەرفی یەو خەفیف

ئەمیش بە وێنەی براکەی وایە
بەس مابەعدی مەد بێدەغم و دایە

مەددی هەردوویان موشبەعەو طەویل
دووەمیان خەفیف یەکەمیان ثەقیل

وەکو (کاف ها) حامیمی ئەعظەم
(قاف والقرآن) ،(نون والقلم)

حەرفەکان هەشتن وەحیی موقەددەس
وان لە مەجموعەی (عَسلکم نَقَص)

ئەندازەی توولیان سێ ئەلفی تەواو
خیلافی قوڕاء نابینی لەناو

بەڵام لە عەینی (مریم) و (شوری)
دوو شێوەی زیاد ڕیوایەت کرا

یەکەم (کالسابق) دووەم دوو ئەلف
یەکەم موختارە (لاتتکلّفٍ)

## مه‌ددی وه‌قف

ئه‌و مه‌دده‌یش له‌به‌ر سکوونی عاریض
دێته ئاراوه به بێ‌موعاریض

مه‌ددێکه له‌به‌ر سکوونی وه‌قفه
نه بۆ که‌لیمه‌و نه له‌بۆ حه‌رفه

که وه‌قفت نه‌کرد ئاگات له خۆ بێ
مه‌ددی طه‌بیعی ئه‌بێ بێته‌جێ

وه‌کو (العقاب) وه‌کو (خالدون)
به وێنه‌ی (بصیر) به وێنه‌ی (ممنون)

ئه‌ندازه‌ی ئه‌ویش سێ ئه‌لفه ته‌واو
مه‌ددی پێ بده به ئیخلاص و تاو

## مه‌ددی لین

مه‌ددی لین هه‌یه له‌سه‌ر ئیشتیهار
واوو یائێکه صاف و زه‌نه‌دار

ماقه‌بل مه‌فتووح ، مابه‌عدی مه‌وقووف
وه‌کو (بَیْت) و (خَوْف) لای قوڕای مه‌عرووف

## مه‌ددی به‌ده‌ل

چه‌ن مه‌ددێکی تر مه‌شهوورن به‌ده‌م
ئه‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ : (ماتقدّم)

مەددی بەدەلی هەمزەی زەنەدار
(آدم) و (إيمان . مؤمِن) دێتەکار

ئەم مەددە ناوی مەددی بەدەلە
بەقەد طەبیعی مەددی ئەفضەلە

## مەددی عیوەض

مەددی عیوەضیش بەوەقفە لەسەر
تەنوینی مەنصووب خۆی ئەخاتەدەر

وێنەی (حَکیما) وێنەی (علیما)
وەکو طەبیعی دێت لە تەعلیما

## مەددی حەرفی

مەددێکی حەرفیش بە وێنەی طاها
حا ، لە حامیما ، کاف ، لە کاف ها

قەسەم بە تەنزیل هەمووی طەبعي یە
سەربەخۆ بوونیان غەیرە شەرعی یە

## مەددی تەمکین

یێ یەکی ساکن کاتێ جێ بگرێ
لەپاش یێی مەکسوور کە موشەددەد بێ

ناوی مەشهوورە بەمەددی تەمکین
وەکو (حُيِّیتم) وەکو (نبیِّین)

## مەددی فاریق

مەددی فاریقی ئینشا لە خەبەر
چوار شوێنی هەیە ڕاست و موعتەبەر

لە ئەنعامەدا (آلذَّكَرَيْنِ)
دوو جار مەذکوورە (یا نور عینی)

(آللە أذِنَ) لە سوورەی یونس
(آللە خیرٌ) لە نەملایەو بەس

ئەمانە هەمووی بەشێوەی جەزمی
ئەڕۆنەوە سەر لازمی کەلمی

## مەددی صیلە

مەددێ بە مەددی صیلە شەهیرە
مەددی تەطویلی حەرەکەی ضەمیرە

بەس بۆ مەکسوورەو مەضموومی طەبعی
نەك بۆ مەوقووف و مەفتووحی فەرعی

بەم شەرتە لەپاش سکوونۆ نەبێ
بە وێنەی (فیه) ئاگات لەخۆبێ

نەلکابێ بەوەیش لەدوایەوە دێ
وەکو (لە الدّین) کاتێ دێتەجێ

صیله موطلّه‌قه لای ئیبنوکه‌ثیر
پاش سکوونیش دێ به قه‌صدی ته‌یسیر

موافیقیه‌تی ئیمامی زانا
حه‌فص له صیله‌ی (فیهِ مُهانا)

ئه‌ندازه‌ی صیله به‌قه‌د یه‌ك ئه‌لفه
یانی مه‌ددێکی طه‌بیعی صیرفه

ئه‌گه‌ر هه‌مزه‌ی قه‌طع بێ به‌دوایا
دوو ئه‌لف‌و نیوه مه‌د له‌ئه‌دایا

وه‌ك (مِن علمه إلّا بما شاء
إنّه اضحك حَسْبما یشاء)

(ألقِه) له نه‌ملا (ارجه) له ئه‌عراف
ساکنن دوورن له صیله‌ی ئه‌طراف

به مه‌د صه‌دهه‌زار صه‌لات‌و سه‌لام
له‌سه‌ر ڕه‌هبه‌ری عاله‌می ئیسلام

له‌سه‌ر مه‌ددی ئه‌و بۆ ئال‌و یاران
بۆ په‌یڕه‌وانیش له ڕۆزگاران

حەرفی مەد عیبارەتە لە ئەلف تێکراو لە واو بەو شەرتە ساکن بێ و ماقەبلەکەی مەضمووم بێ و ، لە یێ بەو شەرتە ساکن بێ و ماقەبلەکەی مەکسوور بێ .

جا حەرفی مەد دوو بەشە : یەکەم ئەوەیە هەر نەفسی حەرفەکە خۆی بێ و لەسەر سەبەبی خاریجی یەوە نەبێ . ئەم نەوعە مەددە پێی ئەڵێن : مەددی طەبیعی و ئەصلی وەکو ئەلفی : قـال ، وە واوی: یقول ، وە یێی : قیل . درێژیی ئەمە بەقەد ئەلفێکە کە بریتی یە لە دوو حەرەکە .

دووەم مەددی عاریضە کە عیبارەتە لەو مەددە بەهۆی سەبەبێکەوە پەیدابووبێ و ئەو سەبەبەیش یا هەمزەیە یا سکوونە ، واقە هەر ئەلفێ یا واوێ یا یێ یەك کە لەپاشیەوە هەمزە ببێ وەکو : جاءَ . یا سکوون ببێ وەکو : آلآنِ . ئەوە ئەو حەرفانە مەددی عاریضیان هەیەو توولیان پێ ئەدرێ زیاد لەوئەندارە کە نەفسی خۆیان داوای ئەکا .

جا ئەو سەبەبە کە هەمزەیە ، یا وا لە عەینی ئەو کەلیمەدا کە حەرفە مەددەکەی تیایەو وا لە پاشیەوە ئەوە مەددەکان پێیان ئەڵێن مەددی موتەصیل ، وە ئەندازەی توولیان بەقەد دوو ئەلف و نیوە ، میثالی ئەمانە وەکو : جَاءَ . یجیئُ . وجِيئَ .

وە ئەگەر هەمزەکە لە کەلیمەیەکی ترا بوو ، وەکو : أتى أمر الله ، ئەوە پێی ئەڵێن : مەددی مونفەصیل ؛ چونکە سەبەبەکەی وا لە لەفظێکدا جیایە لە کەلیمەی مەددەکە . هەروا ناوی بە جائیز ئەبەن ، چونکی ئیختیلافی قوراء هەیە لە ئەندازەی توولەکەیداو لە ئەندازەی ئەم مەددەدا ئیختیلاف هەیە . لەلای بەعزێ قوراء سێ ئەلفەو لەلای بەعزێکی تر دوو ئەلفە . راجیح ئەمەیە کە لەکاتێ خوێندنەوەی پەلەپەلدا بەقەد یەك ئەلفەو لەکاتی تەرتیلدا سێ ئەلفەو لە کاتی تەوەسسوطدا دوو ئەلفە .

ئەگەر سەبەبی مەددەکە سکوونە ، ئەمەیش لەسەر دوو قیسمە ؛

چونکی ئەو سکوونە یا لازمی کەلیمەکەیەو لە هەموو حاڵەتێکدا هەیە . یاخود لازم نیەو لەکاتی وەقفەکردن لەسەر کەلیمەکەدا هەیەو لە غەیری ئەو حاڵەتەدا نیە . جا بەشی یەکەم دوو قیسمە :

یەکەم ئەوە کە لە غەیری فەواتیحی سوورەتەکاندا بێ ، ئەم بەشە پێی ئەڵێن : مەددی لازمی کەلمی ، جا ئەگەر ئەو ساکنە وا لەپاش مەددەکەوە دەغم کرابوو لە حەرفی دواییدا ئەوە پێی ئەڵێن : مەددی لازمی کەلمی موثەققەل ، وەکو (ولا الضّالّين و دابّةو طامّةو صاخّة) . وە ئەگەر ئەو ساکنە دەغم نەکرابوو ئەوە ئەو مەددە پێی ئەڵێن مەددی لازمی کەلمی موخەففەف ، وەکو : (آلآنَ وَقد عَصَيتَ) .

دووەم ئەوەیە لە فەواتیحی سوورەتەکاندا بێ ، ئەم بەشە پێی ئەڵێن مەددی لازمی حەرفی . جا ئەگەر ئەو ساکنە وا لەدوای مەددەکەوە دەغم کرابوو ئەوە پێی ئەلێن : مەددی لازمی حەرفیی ثەقیل ، وەکو (ألف لام ميم) . وە ئەگەر ساکنەکە دەغم نەکرابوو ئەوە ناوی مەددی لازمی حەرفیی خەفیفە ، وەکو حامیم . طاسین . ئەم دووبەشە حەرفی یە ناویان : مەددی موشبەعی حەرفی یە ، ئەندازەی توولی ئەم بەشەو بەشی لازمی کەلمی سێ ئەلفە .

بەشی دووەم لە مەددێ کە لەبەر سکوونی عاریض ئەبێ عیبارەتە لە مەددێ کە پەیدائەبێ لە پێش ئاخری کەلیمەوە لەبەر خاتری وەقفە لەسەر کەلیمەکە ، وەکو : (اولوا الألباب . العقاب . خالدون . مؤمنون . خبير . بصير) لەکاتی وەقفەکردنا لەسەریان . ئەمە لە حاڵی وەقفدا پێی ئەڵێن مەددی عاریضی وەقف . وە ئەندازەی مەددەکەی سێ ئەلفە . ئەگەر وەقفە نەکرا لەسەر کەلیمەکە ئەوە بەس مەددێکی طەبیعی ئەمێنێ

کە پێویستە چاودێری بکرێ . جا ئەوەی تائیستا باسمان کرد لە ئەقسامی مەد هەشت قیسم بوو :

١ ـ مەددی طەبیعی . ٢ ـ مەددی واجبی موتتەصیل .
٣ ـ مەددی جائیزی مونفەصیل . ٤ ـ مەددی لازمی کەلیمی ثەقیل .

٥ ـ مەددی لازمی کەلیمی خەفیف . ٦ ـ مەددی لازمی حەرفی ثەقیل .
٧ ـ مەددی لازمی حەرفی خەفیف . ٨ ـ مەددی وەقف .

لەلای ئەهلی تەجوید چەن بەشی تر لە مەد مەشهوورە کە لەواقیعدا ئەگەرێنەوە بۆسەر ئەم قیسمانە کە رابووردن :

یەکەم مەددی بەدەل کە عیبارەتە لە مەددێ بەدەل بێ لە هەمزەی ساکنی تەخفیف کراو ، وەکو ئەلفی آدم و ییی ایمان و واوی مؤمن . ئەم مەددە لەسەر ئەندازەی مەددی طەبیعی یە .

دووەم مەددی عیوەض کە بریتی یە لە مەددێ کە بەعیوەضی تەنویندا دێت ، وەکو (عليما) لە حاڵەتی وەقفدا کە ئەصڵەکەی (عليماً) بووە بە تەنوین . جا لەکاتی وەقفدا قەلبی تەنوینەکەمان کردوە بە ئەلف .

سێیەم مەددی حەرفی وەکو لەو حەرفانەدا کە لە فەواتیحی سوورەتەکاندا کە دوو حەرفی هیجائی ئەبن ، وێنەی : طاهاو حا لە حامیمداو ها لە کافهادا . ئەمانەیش بەراستی هەر مەددی طەبیعین و بەشێکی زیاد نین .

چوارەم مەددی تەمکینە کە عیبارەتە لە یێ یەکی ساکن کە لەپێشیەوە یێ یەکی شەددەداری مەکسوور بێ ، وەکو : (وإذا حُيّيتم) و (مع النبيّين) ئەمەیش هەر بەئەندازەی مەددی طەبیعی یە .

پێنجەم مەددێکە فاریق بێ لەبەینی ئیخبارو ئینشاءدا ، وەکو : آلـذّكَرين ، وە (آلله أذِنَ) لە سوورەتی نیساءدا ، وە : (آلله خيرٌ) لە سوورەتی نەملدا . ئەم مەددەیشە بەر مەددی لازمی موثەققەلی کەلیمی ئەکەوێ .

شەشەم مەددی لینە کە عیبارەتە لە واوێکی ساکن یاخود یێ یەکی ساکن کە ماقەبلەکەیان مەفتووح بێ و وەقفە لەسەر مابەعدەکەیان کرابێ ، وەکو کەلیمەی (بَيْت) و (خَوْف) لە ئایەتی (وآمَنَهم مِن خَوْف) دا .

حەوتەم مەددی صیلەیە کە عیبارەتە لە واوێ یاخود یێ یەك لەپاش

ضەمیرەوە پەیدائەبێ بەمەرجێ ئەوضەمیرە مەضمووم بێ وەکو : (لَهُ) یا مەکسوور بێ وەکو : (بِهِ) بەشەرتێ لەپێشەوە ساکن نەبێ وەکو : (فیهِ) و مەربووطیش نەبێ بە مابەعدەکەیەوە وەکو (لـه الحَقُّ) و (لهُ الـدِّین) .
بەلاّم ئیبنوکەثیر ئیعتیباری صیلەی مەددە ئەکا لەپاش سکـوونەوە ، وە حەفص موافیقە لەگەڵیا لە ئایەتی (فیهِ مُهانا)دا . میقداری مەددی صیلە بەقەد ئەلفێکە مەگەر هەمزەی قەطعی لەپـاشەوە ببێ ، وەکـو : (ولا یُحیطون بشيءٍ مِن علمِهِ إلاّ بما شاءَ) و (إنّه أضحَك) ئەوە مەددی صیلە لەم شوێنەدا بەقەد مەددی مونفەصیلی جائیزە واتە دوو ئەلفـو نیوە .
بێداربن : هێ لە ئاخری (أَرْجِهْ) لە ئەعرافداو (أَلْقِهْ) لە نەملدا ساکنن و مەددی صیلە نین .

# دەرزی بیستوسێیەم وەقفە

وەقف وەستانە بە یاسای لوغەت
لە هەر شوێنێکا بە هەر کەیفییەت

بەعورفی تەجوید وەستانی قاری
لەسەر کەلیمەی کەلامی باری

ئەقسامی زۆرن بەلاّم بەکورتی
پێت نیشان ئەدەم چوار بەشی پوختی

ئا ئەم چوار قیسمە ئەی برای فەصیح
تامەو کافیەو حەسەنەو قەبیح

## وەقفی تام

وەقفی تام وەقفە لەسەر لەفظێ وا
عەلاقەی نەبێ بەری بۆ دوا

کەوابوو وەقفە لەویا تەواوە
ئیبتیدایش بەولای شیرینەو لاوە

نیشانەی وایە ئەم نەوعە وەقفە
خاتیمەی بەحثە ئەو جۆرە حەرفە

ئەولای ئەووەڵی بەحثێکی ترە
بۆیە ئەو وەقفە لە شیر خۆشترە

یا لەو جێ وەقفا سوورەت تەواوە
سوورەتێکی تر دێ لەدواوە
یا ئەولای صەدای حەرفی نیدایە
یا باسی ئەمرو نەهیی خودایە

یا موصەددەرە بە لامی قەسەم
یا شەرطو جەزای حەققی مجسمّ

یاخۆ مەقامی وەعدو وەعیدە
ئەملاکەی وەعدەو ئەولای تەهدیدە

یاجێی بەیانی دوو حاڵی وایە
کە ضیددی یەکن وێنەی غەوغایە

هەروا بەم شێوە کە بەیانم کرد
فاریق دیارە لای ئینسانی ورد

## وەقفی کافی

کافی وەقفەیە لە شوێنێکی وا
عەلاقەی مەعنا ببێ بۆ دوا

بۆ بەروودوا وەقفی مەعنەوی
ببێ نەك رەبطی ئیعرابی و نەحوی
وەك وەقفە ئەشێ لەوشوێنا بیکەی
ئیبتیدایش ئەشێ بۆ مابەعدەکەی

لەبۆ ئەم وەقفە ئینسانی زانا
گەلێ نیشانەی مەعقوولی دانا

مەئەلەن لەدوای جێگەی وەقفی تۆ
موبتەدا هەبێ یا فیعلێ لەنۆ

یاخود مەفعوولی فیعلێکی مەحذووف
وەك : (سنّة الله) بە نەصبە مەعرووف

یا لەپاشەوە نەفی مەذکوورە
یا جوملەی مایەی (إنّ) ی مەکسوورە

یا حەرفی ئیضراب یاخۆ ئیستیفهام
یا (ألا) لەبۆ میفتاحی کەلام

یا (سێ) و (سوف) حەرفی ئیستیقبال
یا (کلا) لەبۆ تەوبیخی جوهھال

## وەقفی حەسەن

جا وەقفی حەسەن وەقفێکی وایە
لەجێی پەیوەندی لەفظ و مەعنایە

بەم دوو جیهەتە عەلاقەی مەعرووف
بەینی ماقەبل و مابەعدی مەوقووف

بەڵام پاش مەوقووف کەلیمەی لاحیق
موتەممیم نەبێ بۆ لەفظی سابیق

بەدەل بێ یا حاڵ صیفەت یا تەئکید
یاخۆ ئیستیثنای عەللامی مەجید

ئەمانە نیسبەت بەجوملەی مەوقووف
ئەگەرچی نابن بە ڕوکنی مەعرووف

بەڵام ئیبتیدایش بەوانە کاکە
زانا قەت ناڵێ : کارێکی چاکە

مەگەر ئەووەڵ بن بو ئایەی خودا
وەکو مەروی‌یە لە (رسول الله)

لەسەر ئایاتی (سبع المثانی)
یەك یەك وەقفەی کرد تا بە پایانی

دیاره هەروەها ئیبتیدای فەرموو
بەولەفظە بەرزە کە لەدواوە بوو

## وەقفی قەبیح

قەبیح وەقفەیە لەسەر لەفظی وا
پەیوەندی ببێ بۆ بەرو دوا

بە نەوعێکی وا مەحەللی مەوقووف
ئیفادە نەکا بۆ غایەی مەعرووف

بە وێنەی شەرطێ ببرێ لە جەزا
مەوصوولێ صیلەی نەبێ لەگەڵدا

یاخود مەوصووفێ بێ رەبطی صیفەت
موفید بێ بۆ کفر یا لەبۆ بیدعەت

(مستثنیٰ منه) بە بێ (مستثنیٰ)
موجیب بێ لەبۆ فەسادی مەعنا

(وَلا تَقْربوا الصّلوة) نابێ
کە جێگەی وەقفی قاری زانا بێ

یاخود (فویل للمصلّینَ)
کەی شوێنی وەقفە بێ (الذینَ)

لای (الذین) بە بێ صیلەکەی
ئەگەر هوشیار بی چۆن وەقفە ئەکەی

قاری خەبەردار لەسەر موبتەدا
بێخەبەر وەقفە ناکا ئەبەدا

جا لە هەرشوێنێ وەقفە ئاوایە
ئیعادەی مەوقووف شەرتی ئەدایە

یەعنی کە وەستا لەبەر ناچاری
ئیعادەی مەوقووف خێرە بۆ قاری

بێدار بەرەوە ئەی برای شیرین
وەقفەیە نیە واجب بێ بەدین

وەقفی واش نیە بەخۆی حەرام بێ
مەگەر لە شوێنێ مایەی ئاثام بێ

مایەی کوفربێ (أعاذنا الله)
یاموخالیف بێلەبۆ (حکم الله)

لە چەن شوێنێکی دیاری لە قورئان
وێنەی ئەوانە کە ئیستە وتمان

بە شەرتی عیلم و عەمدو ئیختیار
نە بۆ نەزان و موخطیئ و ناچار

جا ئەحواڵی وەقف بۆت بەیان ئەکەم
تا بە فامی حەق ببی خاطر جەم

لە هەر شوێنێکا کە وەقفە ببێ
وەقفە بە سکوون بۆ تۆ دێتەجێ

ئیشمامیش لەبۆ مەرفووع و مەضمووم
لە وەقفا هەیە بزانە مەعلووم

بە لکاندنی لێوانت هەردوو
ئەگەر تۆ مەیلت لەسەر ئیشمام بوو

لەپاش ئیسکانی مەرفووع یا مەضمووم
(أللهُ أَحَد) میثالی مەعلووم

ڕەوم تەحریکە بە دەنگی پەنهان
وا کە بیبیسێ بەعزێ حازران

لە ڕەفعەو ضەمەو کەسرەو جەڕەدا
ئیتر قەت نابێ لەگەڵ فەتحەدا

دوو بەشی حەرەکە لە ڕەوما لابە
لەبۆ ئیختیلاس سێیەك صەوابە

لەکاتی ئەدای فەتحەو کەسرەو ضەم
ئیختیلاس ئەکەن قاریئان بەجەم

بەڵام لەلای حەفص ئیختیلاس نیە
بەس هەر (یتّقِه) تێیدا جاریە

لە (عَليكم الصّيامُ) بە عام
قەت جاری نابێ ڕەوم یا ئیشمام

لە هی ضەمیریش ئەگەر تالی بێ
بۆ ضەممەو کەسرەوە لەبۆ واوو یێ

هەروا تێی تەئنیث وەکو (خافضە)
لەو حەرەکەیشا بڵێن عاریضە

چوار جێگە قارئ سەکتەی تیا ئەکا
یەکەم (عِوَجا) لە ئەلکەهفەدا

لەپاش سەکتەیێ (قَيّماً) ئەڵێیت
لەم وەقفو سەکتە ئاگات لە خۆت بێت

(مِنْ مَرقَدنا) لە سوورەی یاسین
پاش سەکتە (هذا) بڵێ بە تەمکین

سێیەم لەفظی (مَن) لە جوملەی (مَنْ راق)
پاش سەکتە (وَظَنّ أنَّه الفراق)

چوارەم لەفظی (بَل) لەناو (بَل رانَ)
ئای (مطفّفين) باریان گرانە

هەرشوێنی لە قورئانی پیرۆزدا بتەوێ لەسەری ڕاوەستی ، ئەوە بە چەند تەقسیم بەش ئەکرێ ، ئەگەر بەرودوای ئەو شوێنە پێوەندیان بەیەکەوە نی یە نە لە لەفظو نە لە مەعنادا ، ئەوە وەقفەکەت وەقفی تامە ،

واتە وەقفەیەکە شوێنی خۆیەتی ، وەکو وەقفە لەسەر ئاخری سوورەت و وەقفە لەسەر ئاخری باسێ کە لەپێشەوە دەستی پێ کراوە . ئەم نەوعە وەقفە زۆر مەعقوول و موناسبەو پێی ئەڵێن : وەقفی تام ؛ لەبەرئەوە کە نوقصانی لەو وەقفەدا نی یە .

نیشانەی ئەم وەقفە ئەوەیە کە شوێنی وەقفەکە نیهایەتی باسێ بێ و لەپاشیەوە دەست بکا بە باسێکی تر . یا لەپاش (موقوف علیە) یەوە حەرفی نیدا ببێ ، یا ئەووەڵی ئەمرێ یا نەهیێ بێ ، یاخود موفتەتەح بێ بەلامی قەسەم ، یاخود جوملەی شەرطییە بێ ، یا ماقەبلی مەددەکە بەشارەت بێ و مابەعدەکەی ئینذار بێ ، یاخود بەروودوای جێگەی وەقفەکە لەوشتانە بن کە قەت نەلکێن بەیەکەوە .

ئەگەر بەروودوای جێگە وەقفەکە پەیوەندیان هەیە بەیەکەوە لە مەعنادا نەك لە لەفظدا ، ئەوە مەشهوورە بە وەقفی کافی ، هەروەکو وەقفە لەسەر ئەو شوێنەدا باشە ، وەقف لەسەر مابەعدەکەیشی هەر باشە ، بۆ ئەم وەقفی کافی یە چەند نیشانە هەیە ، وەکو وجوودی موبتەداو خەبەر ، یا فیعل و فاعیل ، یا مەصدەرێکی مەنصووب بە عامیلێکی مەحذووف لەدوایەوە یاخود موصەددەر بێ بە کەلیمەی (ألا) بۆ ئیستیفتاح ، یا بە (إنّ) ەی مەکسوورە ، یا بە کەلیمەی (بل) بۆ ئیضراب و لادان لە مەعنای ماقەبلی (موقوف علیە) . هەروا ئەو شوێنانە کە رەبطیان بە ماقەبلیانەوە ببێ لە مەعنادا نەك لە لەفظدا .

ئەگەر ماقەبل و مابەعدی (موقوف علیە) رەبطیان پێکەوە ببێ لە لەفظ و لە مەعنادا و لەگەڵ ئەو عەلاقەدا مابەعدی (موقوف علیە) جوزئی نەبێ لە ماقەبلەکەی ، وەکو فاعیل بۆ فیعل و خەبەر بۆ موبتەداو صیلە بۆ مەوصوول . خوڵاصە ئەگەر لە صوورەتی وەقفە لەوشوێنەدا مەعنای کەلامەکە فاسید نەدەبوو ، ئەوە ئەو وەقفە ناوی وەقفی حەسەنە . بۆ ئەم قیسمە چەن نیشانەیەك هەیە وەکو ئەوە کە مابەعدی (موقوف علیە) حاڵ بێ ، یا نەعت بێ ، یا بەدەل بێ ، یا تەئکید بێ بۆ ماقەبلەکەی ، یا

ئیستیئنابێ لەو . لەم شوێنەدا هەرچەند وەقفە لەوشوێنەدا باشە ، بەڵام ئیبتیدا بە مابەعدەکەی باش نیە مەگەر سەری ئایەت بێ ، وەکو ریوایەت کراوە لە (أمّ سلمه رضی الله عنها) کە حەزرەت (ﷺ) لە ئاخری هەموو ئایەتەکانی فاتیحە وەقفەی کردووەو ئیبتیدای کردووە بە سەری ئـایەتـە دوایی یەکە .

ئەگەر ماقەبل و مابەعدی (موقوف علیه) پێوەندیان پێکەوە بوو لە لەفظ و لە مەعنادا ، بە جۆرێ مابەعدی (موقوف علیه) تەکمیلەو تەتیممە بوو بۆ ماقەبلەکەی ، بەشێوەیەك کە بەهۆی وەقفە لەسەر ئـەو شوێنـە مەعنای جوملە پێشووەکە ناقیص ببێ لە ئیفادەدا ، وەکو وەقفە لەسەر (الحمد) لە فاتیحەداو ، وەقفە لەسەر فیعل لەپێش ذیکری فاعیلە کەی و وەقفە لەسەر مەوصوول پێش ذیکری صیلەکەی ، ئەوە ئەو وەقفە لەو شوێنەدا قەبیحەو ناشیرینە (مع العلم) ئێمە لەکاتی ئیختیار قسە ئەکەین ، ئەنا ئەگەر قاریئەکە هەناسەی توند بوو دروستە وەقفە بکا لەو شوێنانە . بەڵام موستەحەببەو جوانە کە ئیعادەی (موقوف علیه) بکاتەوە لـەگەڵ مابەعدەکەیدا .

بزانن : شوێنێکی وا نیە لە قورئاندا کە وەقفە لەوێدا واجب بێ ، یاخود حەرام بێ ، مەگەر شوێنێ کـە وەقفە لـەوشوێنـەدا زیان بـدا لە ئیعتیقادو بیروباوەر ، ئەوە وەقفە لەوێدا حەرامـەو کوفـرە . وەیا زیـان بگەیێنێ بە عەمەلێ لە ئەعمالی شەرعی ، ئەو وەقفە لەوێدا حەرامە ئەگەر عالم و عامیدو موختار بێ ، بەڵام بۆ قاریئی نەزان یا موخطیئ یا ناچار زیانی نیە . بەڵێ پێویستە بگەرێتەوە بۆ سەر (موقوف علیه) و ئیعادەی بکاتەوە لەگەڵ مابەعدەکەیدا .

## ئیشمامو رەومو ئیختیلاس

بزانن : وەقفە لەسەر هەر لەفـظێ بە سکـوونی (موقـوف علیه) ئەبێ ، یا نائیبی سکوون کە ئەلفە لە مـونەووەنی مـەنصووبـدا ، وەکو

ئەڵێیت (وَكان الله عَليماً حكيماً) .

بەعزێ حاڵەتی‌تر هەیە لە وەقفدا ، وەکو ئیشمام بۆ مەرفووع لە موعرەباتداو مەضمووم لە مەبنییاتدا ، ئەو ئیشمامە عیبارەتـە لەوە کـە لەپاش ئیسکانی (موقوف علیه) هەردوو لێوی بلکێنێ بەیەکەوە بۆ ئیشارە ئەلای ئەوە کە ئەو (موقوف علیه) یە مەضمووم بووە ، وەکو : (الله أحَد) بە سکوونی دال لە وەقفەداو بە ضەممی شەفەتەین پاش ئەو ئیسکانە ، وەکو وتمان .

لێرەدا دەرکەوت کە ئیشمام نی‌یە لە وەقفـە لەسـەر مەجـروورو مەنصووبدا .

ڕەوم عیبارەتە لە تەحریکی (موقوف علیه) بە دەنگێکی پەنامەکی وەهـا کە حـازرانی مـەجلیس نـەیبیستن . ڕەوم هـەر لـە مـەرفـووع و مەجروورردا هەیەو لە مەفتوحدا نی‌یـەو ئەبێ دوو بـەش لەو حـەرەکە بفەوتێنێ‌و تاقە بەشێکی بمێنێ .

ئیختیلاس لە هەموو حەرەکەیەکدا هەیە کە عیبارەتە لە لابردنی سێیەکی ئەو حەرەکەیە . لای ئیمام حەفص ئیختیلاس نی‌یـە ئیللا لە لەفظی (يَتَّقِه) دا .

بزانن کە ڕەوم‌و ئیشمام لە میمی (كتب عليكم الصّيام) دا نی‌یە بە ئیجماعی قاریئەکان ، وە لە هێی ضەمیردا کاتێ کـە لەدوای کـەسرەو ضەممەوە بێ ، یا لەپاش واووێی وە بێ . هەروا لە تێی تەئنیث‌و حەرەکاتی عاریضە ، یانی : غەیرە ئەصلییەدا .

بێداری : لە قورئانی پیرۆزدا چوار سەکتە هەیە کە ئەبن بەهۆی جیاکردنەوەی کەلیمە لە پاشەکەی

یەکەم : لە لەفظی (عِوَجا) لە سوورەتی (الكهف) دا . دووەم : لە لەفظی (مِنْ مَرقَدِنا)دا . سێیەم : لە لەفظی (مَنْ راق) دا . چوارەم : لە لەفظی (بَل) لەپێش فیعلەکەوە لە (بل رانَ) دا .

# دەرزی بیست‌وچوارەم ئیبتیدا

که وەقفت زانی لەلای موقتەدا
هەم وەربگرە لێی حاڵی ئیبتیدا

ئیبتیدا نابێ بە حەرفی ساکن
بێنە هەمزەی وەصڵ (لذي الأماكن)

مەصدەرو ماضی ئەفعالی مەزید
هەمزەی ئەووەڵیان وەصڵە بەتەجوید

هەروا فیعلی ئەمر موطڵەقا وەصڵە
بەس هەمزەی ئیفعال بۆ قەطع و فەصڵە

هەمزەی دە ئیسمیش هەر لەبۆ وەصڵە
ماباقی قەطعن ئەم یاسا ئەصڵە

(ابن) و (ابنم) و (امرء) و (اثنان)
(ايمن) و (است) و (ابنة ، اثنتان)

(امرأة) و هەمزەی (ال) لەبۆ تەعریف
هەر هەمزەی وەصڵە فەتحەی بۆ تەخفیف

لە ئیبتیدادا مەوجودن هەموو
لەناوا ئەڕۆن فەورەن زووبەزوو

* * *

هەرچی بۆ قەطعە لە هەمزەکانا
ئەمێنێتەوە لە گشت مەکانا

بە موناسەبەی وەقف و ئیبتیدا
بە یاسای تەعلیم لەبۆ ئیقتیدا

بۆت بەیان ئەکەم (بتوفیق الله)
حاڵی (تعوذ) لەگەڵ (بسم الله)

(تعوذ) لەپێش خوێندنی قورئان
سونەتی دینە بە نەصصی تیبیان

چ لە ئەووەڵی سوورەتەکانا
یا لە ناوەدا یا لە پایانا

هەروا (بسم الله) ئەووەڵی سوورە
غەیری (براءة) وەکو مەشهوورە

چونکە بەفکری زوربەی زاناکان
(بسم الله) جوزئە لە سوورەتەکان

فکری ئیمامی شافیعیش وایە
ئەم فکرە بکە بە پایەو مایە

بابی ئادابی تیلاوەی ئیتقان
ئەم باسە ئەکا بە (حق البیان)

هەروا (بسم الله) لە ئەثنای سوورەت
لەپێش خوێندنا سوونەتە سونەت

لە شافیعی وە شێخی عیبادی
ئەم نەقلە ئەکا بە دڵگوشادی

بۆ (استعاذه) و (بسمله) و سووره
چوار شێوەی شیرین لامان مەشهووره

قەطعی هەموویان یەك لەیەك برین
وەصڵی هەموویان یەك بەیەك گەیین

وەصڵی (تعوّذ) بە بەسمەلەو بەس
وەصڵی بەسمەلەو سوورەت بە نەفەس

(بسم الله) کەوتە بەینی دوو سوورەت
سێ شێوەی هەیە کاتی تیلاوەت

یەکەمین قەطعی هەموویان لە یەك
دووەمین وەصڵی هەموویان بە یەك

سێیەمین وەصڵی (بسم الله) تەنیا
بە سوورەتی دوا ئەی برای وریا

وەضڵی (بسم الله) بە سوورەی پێشوو
قەطعی لە دوایی بە جەفا مەحشوو

مادام ئەقسامی وەقف مەعلووم بوو بۆتان ، ئەحوالّی ئیبتیداش بزانن :

بە ئیتتیفاق ئیبتیدا بە ساکن موتەعەسسیرو مەهجوورە ، وە بۆ دەفعی ئیبتیدا بە ساکن پێویستە جەلبی هەمزەی وەصل بکەین . ئەم هەمزەیە لە حالّی ئیبتیدا بە کەلیمەدا ثابیتەو لە حالّێکدا بکەوێتە بەینەوە فەورەن ساقط ئەبێ ، بەلاّم هەمزەی قەطع وەکو هەمزەی بابی (إفعال) و هەمزەی هەرچی (أسماء) هەیە ئیللا دە ئیسم نەبێ ، هەمووی لە ئیبتیداوە لە بەینا ثابتەو لە شوێنی خۆیا ئەمێنێتەوە .

جا بزانن : هەرچی هەمزە هەیە لە ئەووەلی ئەفعالی (ثلاثی مزیدفیە) و (رباعی مزیدفیە) و لە ئەووەلی مەصدەرەکانیانەوە هەموو هەمزەی وەصلّن ، ئیللا هەمزەی بابی (افعال) کە (ثلاثی مزیدفیە) موصەددەر بە هەمزەیە .

هەرچی هەمزەیش لە ئەووەلّی ئیسمەکانەوە هەیە ، وەکو ابراهیم و اسماعیل و اسحاق ، هەموو هەمزەی قەطعن ، ئیللا لە دە ئیسما کە عیبارەتن لە : ابن ، ابنة ، ابنم ، اثنان ، اثنتان ، امروء ، امرأة ، اسم ، است ، ایمن الله . هەروا هەمزەی (ال) کە حەرفی تەعریفە ئەویش بۆ وەصلّەو لەبەر تەخفیف مەفتووحە .

جا بە موناسەی باسی ئیبتیداوە ، باسی ئیبتیدا بە (استعاذة) و (بسم الله) ئەکەین لەگەلّ خوێندنی قورئانی پیرۆزدا . بۆ ئەم دووانە لەگەلّ سوورەتدا چوار شێوە هەیە :

یەکەم : قەطعی هەموویان لە یەك ، واتە پاش ئەوە کە ویستت قورئان بخوێنی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بخوێنەو وەقفەیەك بکە ، جا (بسم الله الرحمن الرحیم) بخوێنەو وەقفەیەك بکە ، جا دەستبکە بە خوێندنی قورئان بەقەد مەیلی خۆت . دووەم : وەصلّی هەموویان ، بەمشێوە لەپاش (استعاذة) گورج (بسم الله) بخوێنەو جا قورئان بخوێنە .

سێیەم : وەصڵی (استعاذة) بە (بسم الله) وە جا وەقفەیەك بکەو جا قورئان بخوێنە .

چوارەم : قەطعی (استعاذة) لە (بسم الله) و وەصڵی (بسم الله) بە خوێندنی قورئانەوە ، واتە پاش (استعاذة) وەقفەیەك بکە جا (بسم الله) بخوێنەو گورج قورئان بخوێنە .

خۆ ئەگەر ویستت پاش تەواوکردنی سوورەتێ دەست بکەی بە سوورەتێ‌تر ، لێرەدا سێ شێوە هەیە :

یەکەم : قەطعی هەموویان لە یەك ، واتە پاش تەواوبوونی سوورەتەکە وەقفەیەك بکە ، جا (بسم الله) بخوێنەو وەقفەیەك بکە ، جا دەست بکە بە سوورەتەکەی دواوە .

دووەم : وەصڵی هەموویان ، واتە : پاش تەواوکردنی سوورەتەکە گورج (بسم الله) بخوێنەو دەست بکە بە سوورەتی دووەم .

سێیەم : وەصڵی (بسم الله) یە بە سوورەتی دواوە ، واتە : لەپاش تەواوکردنی سوورەتی پێشوو وەقفەیەك بکە ، جا (بسم الله) بخوێنەو گورج دەست بکە بە خوێندنی سوورەتی دواوە .

بەڵام ئیحتیمالی چوارەم کە ئەوەیە : (بسم الله) وەصڵ بکەی بە سوورەتی ئەووەڵەوەو لەپاش وەقفەیەك دەست بکەی بە خوێندنی قورئان لە سوورەتی دووەم ، ئەمە مەذمووم و مەهجوورەو خیلافی سوننەتی حەزرەتە (ﷺ) .

بزانن : لەپێش دەست کردندا بە خوێندنی قورئان (استعاذة) سوننەتە تێکراو نەصصی ئایەتی لەسەرە . خودا فەرموویەتی : (وإذا قَرأتَ القرآنَ فاسْتَعِذ بالله) .

هەروا سوننەتە خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحيم) لە ئەووەڵی هەر سوورەتێکەوە دەستی پێ ئەکەی ، غەیری سوورەتی (براءة) ، چونکی لەلای زوربەی ئیمامەکان (بسم الله الرحمن الرحيم) داخڵی هەموو سوورەتەکانەو بە ئایەتێ ئەژمێرری لەوان بێ فەرق لەبەینی سوورەتی

فاتیحەو باقی سوورەتەکاندا ، بە دەلیلی ئەوە کە حەزرەت لە ئەووەڵی هەموو سوورەتێکەوە ـ غەیری (براءة) (بسم الله الرحمن الرحيم) ی خوێندووە ، ظاهیریش لەمە ئەوەیە جوزئی سوورەتەکە بێ هەرچەن کلیلی سوورەتەکەیە . بە دەلیلی ئەوەیش کە حەزرەت وەفاتی کردو ئەصحابەکان لەکاتی جەمعی قورئاندا چ لە عەهدی ئەبوبەکرداو چ لە عەهدی عوثماندا (بسم الله) یان نووسیوە لە ئەووەلی هەموو سوورەتێکەوە غەیری (براءة) . هەروا بە دەلیلی موافەقەی فاصیلەی (بسم الرحمن الرحيم) لەگەڵ فاصیلەی باقی ئایەتەکاندا .

هەروا ئەگەر لە ناو قەدی سوورەتەکاندا قورئان بخوێنی ، هەروەکو (استعاذة) سونەتە (بسم الله الرحمن الرحيم) یش سونەتە .

سیوطی لە (اتقان) دا لە ئادابی خوێندنی قورئاندا ئەڵێ : ئیمامی عیبادي ئەم قسەیەی نەقڵ کردووە لە ئیمامی شافیعی یەوە (رضی الله عنه) . ئەم مەوضووعانە زۆر موناسبە کە خوێندەوار بیانزانێ بۆ رەفتار بە سونەتی حەزرەتی فەخری عالەم محمد المصطفی صلی الله علیه وعلی آله وصحبه واتباعه باحسان إلی یوم الدین .



# ئامۆژگاری گشتی

ئامۆژگاري يه بۆ گەورەو بچووك
مەروانن بۆ خۆ بە چاوێکی سووك

ئینسان خەلیفەی خودای ئەکرەمە
(خلیفة الله) پایەی ئەعظەمە

ئەگەر ئادەمی پایەدار نەبێ
ماددەی کائینات بێمەدار ئەبێ

ئادەمی جێگەی جیلوەی خودایە
دڵی ڕووناکی عەرشی باڵایە

صەدو بیستوچوار هەزار پێغەمبەر
بۆ قەدری بەشەر کران بە ڕەهبەر

سا مەگەر یەکێ مایەی نەگبەت بێ
ڕووی لە تاریکی و باری زەحمەت بێ

ئەگەرنا ئینسان کانی ئیحسانە
خەزێنەی خێرو فەیضی ڕەحمانە

بۆیە لەم نەوعا خودا بە کەرەم
ڕەهبەرانی نارد ئادەم تا خاتەم

عاقیبەت ناردی رەهبەری ئەمین
موحەممەد بەخێر لەبۆ عالەمین

قورئانی بۆ نارد بۆ ڕێی سەعادەت
بۆ بەختیاری تاجی عیبادەت

مادام ئاوایە پایەی ئادەمی
بۆ پایە ببنە مەردی عالەمی

دین و دونیای پاك بەختیاری یە
بۆ ماوەی ژیان ڕێی سەرداری یە

بەر لە هەموو شت بروانن بۆ دین
لەسەر سونەتی (فخر المرسلین)

منداڵتان ببەن بۆ مەدرەسەکان
لەبۆ فێربوونی ئایاتی قورئان

قورئان ڕێنومای ئادەمیزادە
عەقڵ و حیکمەتی ڕۆحی ئازادە

قورئان بۆ دین و بۆ ژینی ئینسان
یەکەم یاسایە لەسەر ڕووی جیهان

ئەمرە بە راوێژ بۆ گەورەی سەربەرز
ئیطاعەی گەورەی داناوە بە فەرز

ئەمرە بە عەدڵو بە یاسای ئیحسان
ئەمرە بە دووری لە مایەی نوقصان

ئەمرە بە عیلمو عەمەلی بەسۆز
ئەمرە بە جیهاد بۆ غایەی پیرۆز

ئەمرە بە صیلەی رەحمی خزمو خۆیش
هەم ئەمرە بە صەبر لەسەر ئێش و نێش

عیلمە حیکمەتە ئەدەبەو ئەمثال
دەرمانی دەردە حەللالی ئیشکال

دەلیلە لەبۆ رێگەی سەعادەت
چ بۆ ژینی باش چ بۆ عیبادەت

تەقوایە زوهدە صیدقە صەفایە
شەرمەو شەرەفەو عەهدو وەفایە

چرایێ روونە لەبۆ رۆژی رەش
صەفای دەروونە بۆ شەخصی بێغەش

بەکورتی قورئان چرای ظولماتە
لەبۆ ژین و دین ئاوی حەیاتە

کەوابێ فەرزە لەرێی ئەم نوورا
خۆت بدەی بەسەر گرەی تەنوورا

قوتابخانەکان وێنەی بەیتوڵڵا
بکەی بە مەخزەن بۆ کەلامولڵا

هەتا ڕۆڵەکان بەنووری کەلام
ببن بە خاوەن بۆ نووری ئیسلام

دەرزی تەجویدو تەرتیلی ئایات
وەربگرن لەبۆ نوورو بەرەکات

لەهجەیەکی خۆش بکەن بەعادەت
چ لەبۆ خۆتان چ بۆ جەماعەت

خوێندنی قورئان بە شێوەی دڵگیر
جوان ئەکاتەوە دڵی شەخصی پیر

ئینسان ئەکێشێ بۆ ڕێی پیرۆزی
بۆ صیدقو صەفاو ڕەحمو دڵسۆزی

لادەن لە نەغمەی موناڤی تەجوید
دوورە لە نووری قورئانی مەجید

هەر زەمێ هاتوە بۆ نەغمەی قورئان
هاتووە بۆ نەغمەی زیادیو نوقصان

ئەو لەهجە مەقصوور بکا بە مەمدوود
یا عەکسی ئەوە مەذمومەو مەردوود

مەددێ بێحەد بێدووره لە ثەواب
ناگونجێ لەگەڵ مەقامی کیتاب

کە قورئانتان خوێند زوو بیکەن لەبەر
هەمووی یا نیوەی یا لەوە کەمتر

قورئان سەراسەر عیلم و عیرفانە
عەقیدەو دیدەو دڵ و زمانە

هەر دڵێ قورئان لەوا دامەزرێ
بە ئیمان ئەژیو بە ئیمان ئەمرێ

هەروا لەگەڵیا تا (دار البقا)
تا شادی ئەکا بە نووری لیقا

* * *

عولوومی ڕەسمی لە نەحوو لە صەرف
ئیعراب و بیناو قەلب و دەغم و حەذف

لەگەڵ زانستی ئەصڵی ئیشتیقاق
ئینسان ئەباتە سەر قوللەی ئافاق

لوغەت و وەضع و مەعان و بەیان
فیقهو ئوصوول و حیکمەتی ئینسان

ئوصوولی دین و تەفسیرو حەدیث
خادم ئەباتە مەقامی ڕەئیس

عیلمی مەنطیق و ئادابی سوئال
چران بۆ ڕێگەی دەعواو ئیستیدلال

هەموو ئەمانە خزمەتن بۆ تۆ
بۆ دونیاو بۆ دین هەتا ڕۆژی نۆ

## ئادابی تیلاوەتی قورئان

بە ئادابی دین تیلاوەی قورئان
ئەساسە لەبۆ تەنویری دڵمان

بەر لە تیلاوەت دەستنوێژ بگرن
سیواك بکەن و قورئان هەڵبگرن

ئەگەر ئاو نەبوو (تیمّم) چاکە
دەس نوێژ سیلاحی موئمینی پاکە

لەپاش طەهارەت بڕۆنە مزگەوت
یا لە ماڵەوە هەرچۆنێ ڕێکەوت

کە چویتە مزگەوت بە دڵێکی صاف
نییەت بهێنە لەبۆ ئیعتیکاف

لەپاش دوو رکاتی دیاریی مزگەوت
قورئان بخوێنە هەرچەندێ ڕێکەوت

بە خاطرجەمعی قورئان بخوێنە
دڵت بە نووری خودا بنوێنە

ئێمە غافڵین حەق غافڵ نی یە
لە نوور وەرگرتن دڵ ماتڵ نی یە

ئەگەررێ نەکەوت قورئان لە جێدا
قورئان بخوێنە لە ماوەی رێدا

بەڵام جادەیەك پاك لە نەجاسەت
لایق بێ لەبۆ ذیکرو تیلاوەت

گەلێ پێویستە شەخصی موسوڵمان
دائیم طالب بێ بۆ نووری قورئان

بەقەدری ئیمکان قورئان بخوێنێ
خۆی لە غافڵان باش دەربهێنێ

خوزگەم بەوکەسە قورئان ئەخوێنێ
بەهەشتی خالید بۆ خۆی ئەستێنێ

بە رۆژ یا بە شەو چلۆن رێکەوێ
لە قورئان خوێندن پەکی نەکەوێ

(بین الطلوعین ، بین المغربین)
یا.لەپاش عەصران یا شەو بەینەبەین

شەو خەڵوەتگاهی ئەهلی ئیحسانە
بە زایەی نادا ئەوەی ئینسانە

بۆ شەو هەستاوە بای (تتجافی)
بۆی ڕەحمەت ئەدا بە دڵی صافا

ڕۆژ بۆ زەحمەتەو بۆ حەولی ژیان
شەو بۆ ڕەحمەتەو بۆ نووری ئیمان

بەڵێ شەو بۆ خەو خەو بو سوباتە
سوبات ڕەحمەتی ماوەی چەن ساتە

خۆ دانەنراوە شەو هەتا بەیان
ئادەمی بنوێ بە وێنەی بێ گیان

یا تا نیوەشەو بە لەهوو لەعەب
عومرت رابووری لەگەڵ بێ‌ئەدەب

بەش بەشی بکە بە یاسای ساعەت
سێ بەش لەبۆ خەو بەشێ بۆ طاعەت

شەوی شەش سەعات ئینسان بخەوێ
لەشی بۆ سیححەت پەکی ناکەوێ

مەقصەد ئەمەیە هەرکەسێ بۆ خۆی
میزانێ دانێ سوودی ببێ بۆی

لەسەر خوێندن و خوێندنەوە تۆ
قورئان قازانجت پێ ئەدا کۆکۆ

حەزرەت فەرموویە : رۆژی دە ئایەت
بخوێنێتەوە دوورە لە غەفڵەت

حەرفێ دە ئەجرە لەبۆ دە صەدە
ئەوابێ قورئان خاریج لە حەدە

نەك هەر لەبۆ خۆی بۆ خزم و کەسی
ئەبێ بە مایەی ڕەحمەتی قودسی

ئەگەر صەد ئایەت بخوێنێ بۆ دین
ئەینووسن لەناو ڕیزی قانیتین

گەیشت بە دووصەد ئایەتی قورئان
حیفظی ئیمانەو وەسیلەی غوفران

پێشینانی تۆ بە دڵێکی صاف
قورئانیان ئەخوێند (الله) بێ گەزاف

واز بێنە لەوەی لەسەر دەست و برد
بە شەوو ڕۆژی خەتمێکی ئەکرد

تۆ حەفتەی خەتمێ یا بە دوو حەفتە
یا مانگی خەتمێ خێرێکی مفتە

هەرچەندێکت خوێند لە زۆرو لە کەم
بە ئارامی بێو صەفای خاطرجەم

دە ئایەت لەگەڵ تەجویدو تەرتیل
چاترە لە خەتمێ بە شێوەی تەعجیل

ئەمەیە دەرزی شیووخی کیرام
خێرە تیلاوەی ئینسانی ئارام

بە ئاوازی خۆش قورئان بخوێنە
نووری سەعادەت بۆ دڵ بنوێنە

کە گەیشتیتە ئایاتی رەحمەت
بپاڕێرەوە بۆ نەیلی نیعمەت

کاتێکیش خوێندت ئایاتی عەذاب
زوو پەنابگرە بە خودای وەهھاب

وا بریاربدە کاتی تیلاوەت
موناجات ئەکەی لای (ربّ العزة)

تۆ ئەو نەبینی ئەو تۆ ئەبینێ
تەجەللای کەرەم بە تۆ ئەنوێنی

کە خوێندتەوە ئایاتی سوجدە
یەك سوجدە ببەو بیکە بە موژدە

سوجده کلیله بۆ قاپی ڕەحمەت
فرصەتێ بەرزە فرصەتێ غەنیمەت

بەڵام براکەم ئاگات لەخۆ بێ
با دەستووری شەرع ڕەهبەری تۆ بێ

نەبێ بە ئازار بۆ شەخصی نەخۆش
یاهۆی بیداری بۆ نوستووی بێهۆش

چەن کات و چەن جێ لەسەر ڕووی جیهان
مەکە تیلاوەی ئایاتی قورئان

مەکرووهە کاتی هێرشی نوستن
یا بەماندوویی لەجێدا کەوتن

یا کاتی خوطبەی خەطیبی جومعە
ئەوکاتە کاتی ئیرشادی جەمعە

کاتی تەدریس و تەعلیمی عولووم
نەبێ بە مایەی تەشویشی عومووم

یا کاتی وەعظ و ئامۆژگاری دین
یا کاتی نوێژی فەرزی موسلیمین

یا لەو شوێنانە پیسەو ناپاکە
پیس لەگەڵ پیسەو پاك لەگەڵ پاکە

یا لە ڕێگایەك ڕێڕەوی زۆرە
لە پاكْ و لەپیس بەڵەك و بۆرە

لە شوێنی غەوغاو ئاشووبی جیهان
فریشتەی ڕەحمەت پەنهانە پەنهان

بێدار ببنەوە خوێندن لە موصحەف
چاكترە لەبەر ئەثوەبەو ئەشرەف

پیرۆزی قورئان ئەگا بە چاوان
ئەگا بە بەدەن بۆ پیرو لاوان

تەنیا تەماشای قورئانی كەریم
ثەوابی زۆرە لای خودای عەلیم

تەهلیل و تەكبیر ، تەحمید بۆ خودا
ڕیوایەت كرا لە (رسول الله)

لە سوورەتی (شرح) تا سوورەتی (ناس)
بەجێیان بێنە بە صیدق و ئیخلاص

لە ئاخرەوە پاش خەتمی سوورە
وەكو لەناوا ئەمڕۆ مەشهوورە

چ لە نوێژا بێ و چ تەنیا قورئان
هەرچەندە نایكەین لەناو نوێژەكان

لەناو فەتاوای خاتیمەی صوغرا
موژدەی ئەوابێ بە ئێمە درا

* * *

پاش قورئان خوێندن یا خەتمی قورئان
دوعای خێر بکەن بۆ موسوڵمانان

دوعا لەوکاتا ئەگا بە قبووڵ
لەبەر پیرۆزی قورئانی مەقبووڵ

بۆ خۆت و ئەصڵ و فەصڵ و حاشیە
ئەگەر موطیعەو ئەگەر عاصی یە
هەم لەبۆ باقی موسوڵمانەکان
لە هەر شوێنێ بن بە ماواو مەکان

دوعا بۆ پارێز لە ئاشووبی غەیر
هەم لەبۆ تەوفیق لەسەر کاری خەیر

کە تۆ دوعات کرد بەصوورەتی عام
زوو وەری ئەگرێ عەلیمی عەللام

مەبەس لە دوعا فەوزی مەرامە
موهیم طاعەتەو حوسنی خیتامە

قاپی رەحمەتی وا لەسەر پشتە
ئەم دیوی دینەو ئەودیو بەهەشتە

* * *

بێدار ببنەوە فەرزە لەسەرمان
ئیکرامی گەلی حوففاظی قورئان

حیفظی فەرزێکە فەرزی کیفایە
ئەوان ئەم فەرزە ئەکەن ڕیعایە

حافیظ خەڵاتی ڕەهبەری لایە
ئەوەندە هەیە وەحیی بۆ نایە

خۆزگەم بە حاڵی حافظێکی وا
دڵی بە قورئان ئاوایە ئاوا

* * *

ئەگەر ئەتەوێ ئەوابی قورئان
هەدییە بکەی بۆ موسوڵمانان

کە دەستت پێ کرد نییەتێ بێنە
بەو نییەتەوە قورئان بخوێنە

لەپاش خەتمەکەی زوو ئیهدای بکە
میثلی ئەوابی بۆ بڕیار بدە

پێش هەموو لەبۆ شای پێغەمەران
لەگەڵ ماباقی گەلی ڕەهبەران

سەردەستەی دیاری بۆ پێغەمەرە
بۆ (روح الأرواح) کە خۆی سەروەرە

سەلامی خودای لەسەر بێ تا سەر
هەتا هەتایە نەك هەر تا مەحشەر

لەپاش ئەو لەبۆ برادەرانی
لە ڕەهبەرانی سابیق زەمانی

پاش ئەوان لەبۆ هەموو یارانی
بۆ ئالی بەرزی وەفاکارانی

بۆ ئەهلی بەیتی هەموو بەجارێ
بە وێنەی باران سەلام بباریْ

ئەمجار بۆ هەموو فەردێ لەوانە
پەیڕەوی خێر بوو لەبۆ ئەمانە

بە فکری گەلێ لە عولەمای دین
خێریان پێ ئەگا بە (علم اليقين)

هەرچەندە قارئ ئەوابێ بۆ خوی
ساغەو ثابتەو نەقصی نایێ بۆی

یەکەمین لەسەر ئەم فکرە بەمەد
ئیبنوحەنبەلە ئیمامی ئەحمەد

باشە بزانن ئیهداء بۆ ڕەسوول
هەر بۆ تەشریفەو ئیکرام و وصوول

ئەگەرنا هەموو ئەوابێ ئوممەت
میثلی کامیلی ئەگا بە حەزرەت

بەڵکو بەقەدەر واسیطەی مابەین
ئەضعاف تەکرارە تا شاهی کەونەین

ژمارەی ئەوە مەگەر لای خودا
ئێمە نازانین مەر یەك لە صەدا

لە یەکدا دە بێ لە دوودا بیستە
لە سێدا چلە ئەم یاسا بەستە

هەم والیدەین و ئوستادی تەعلیم
شەریکی ئەجرن بە صیدق و تەسلیم

ئەوەی مونکیری دیاری ئیحسانە
هەر لە صوورەتا وێنەی ئینسانە

بابێ لە حیساب قانوونی عەدڵە
چەند بابی ئەواب مەقروونی فەضڵە

هەروەها چاکەی ئوممەت سەراسەر
بەم وەزنە ئەگات بە ڕۆحی ڕەهبەر

چون ئەو وەسیلەی هیدایەی عامە
ئەو موبەللیغی نووری ئیسلامە

نووری قورئان و شەریعەت یەکسەر
وا لەسەر عەرشی سینەی پێغەمەر

هەرکەس لە هەرجێ بە هەرچۆنێ بێ
خزمەتێکی باش لەوۆ بێتەجێ

مەنبەعی هەمووی (رسول الله) یە
سینەی ئەو دەریای ڕەحمی خودایە

خودا لەو دەریا دڵان تەڕ بکەی
بە کانیی فەضڵ و فەیضٖ و فەڕ بکەی

بە جاهی شاهی ڕەهبەران بەعام
خەڵاتمان بکەی بە حوسنی خیتام

## خاتیمەی نوور بە پاڕانەوەی حضوور

(الحمد لله) گەیشتە خیتام
(نووری قورئان)م بەگوێرەی مەرام

خاتیمەم هێنا خزمەتی قورئان
بەقەد شانی خۆم نەك ئەعلامەکان

خزمەتەکەیشم کرد بە دیاری
لەبۆ حضووری مەحبووبی باری

لەبۆ بارەگای بەرزی پڕ ئەنوار
بۆ تکاکاری گەلی تاوانبار

بۆ تکاکاری کۆمەڵی ئەخیار
فیداکارانی چەرخی ڕۆزگار

بۆ ئەوان لەبۆ ڕزگاری و نەجات
بۆ ئەمان لەبۆ بەرزیی دەرەجات

خۆیشم یەکێکم لە تاوانباران
لە بەدکرداری لە شەرمەساران

شەرمەساریکم هاتم بۆ دەرگات
پەنام هێناوە (یا ذا البرکات)

لەبۆ ئەنوارێ بۆ دڵی تاریك
پێی ڕزگار ببم لە ڕێگەی باریك

لەبۆ یارمەتی لە ماوەی ژینا
لەسەر خزمەتی لە ڕێگەی دینا

بۆ دەفعی فیتنەی نەفسی ئەممارە
بۆ چاری شەیتان لەم ڕۆزگارە

(کی اعتمد روحا علی الله
وأفوّض امری إلی الله)

باوەڕم وایە خەیرولوەسیلەی
وەسیلەی نوورو نەیلی فەضیلەی

ئەزانم نووری قورئانی بێحەد
سەری وا لەلای واحیدی ئەحەد

ئەم سەرەکەیشی بۆ فەیضی مەدەد
لە سینەی تۆدا ئەبتە موجەددەد

یانی ڕۆحی تۆ (یارسول الله)
مەظهەرە لەبۆ تەجەللای ئەڵڵا

ئەو ڕۆحە کەوا (روح الأرواح)ە
مەنبەعی نووری خێرو ئیصلاحە

هەزاران ڕشتەی لێوە دەرئەچێ
ئەگا بە دڵێ حوببی تۆی تیابێ

یانی ڕۆحی تۆ سیرڕی پەنهانە
جێگەی کارەبای هەموو جیهانە

بە بێ ژمارە خطووطی وایر
ئەگا بە دڵی موحیببی طاهیر

بەڵکو بە هەموو عەبدێکی خودا
کە دۆستی تۆ بێ بۆ فەیضی هودا

ئەم ڕەبطەیش بە دڵ هەتا هەتایە
چونْ کارەباکەی خاوەن بەقایە

منیش هەرچی هەم خۆ لە ئومەتم
لەم بارەگادا ڕوو لە ڕەحمەتم

نووریکم ئەوێ بۆ رابیطەی بەین
(یا معدن العلم یا منبع العین)

رابیطێ وابێ دائیمو تام بێ
بۆ من وەسیلەی حوسنی خیتام بێ

دووبارە لە نۆ (الحمد لله)
لە (نووری قورئان) بەشمان پێ درا

بەرەسایی هات بۆ هێزی دڵمان
بۆ چرای دڵو ماڵو مەنزڵمان

بیستەمی صەفەر شازدەی نیسان
پێش نوێژی جومعەی (مجمع الاحسان)

لە حوجرەی بەرزی مەدرەسەی ثانی
لە بارەگاهی غەوثی گەیلانی

(قدس الله سره العزیز
بالنور الساری لأهل التمییز)

تاریخی کۆچی شای شیرین خیصال
هەزارو سێصەد نەوەدو یەك ساڵ

مێژووی میلادی عیسای پڕکەماڵ
هەزارو نوصەد حەفتادو یەك ساڵ

سەلامی خودا بێ‌حەدو حیساب
نازڵ بێ بۆیان هەم ئالو ئەصحاب

بەندەی نووسەری ئەم چەن دەرزانە
ئەم جەواهیری ڕووی سەرعەرزانە

ناوونیشانم بە شێوەی خالیص
عەبدولکەریمی لەقەب مودەڕڕیس

ناز ناوی شیعرم بەشێوەی عامی
بۆ بابی ئەدەب ئەنووسم (نامي)

(فالحمد لله حَمْداً بالتّمام
على الانعام بحسن الختام)

(الحمد لله) لێ‌بوومەوە لە نووسینی کتێبی (نووری قورئان) لە سیرەتی حەزرەتداو لە تەئریخی قورئان و عولوومی قورئان و تەجویددا ، لە ڕۆژی جومعەی بیستی صەفەری ساڵی هەزارو سێ صەدو نەوەدو یەکی هیجری ، ڕێکەوتی شازدەی نیسانی هەزارو نۆصەدو حەفتاویەکی میلادی ، لە مەدرەسەی گەیلانی لە بەغداد . وانا الفقير عبدالكريم محمد المدرس الكردي الشهرزوري غفر الله له ولوالديه ولسائر المسلمين ، آمين .

# پێڕست

